# هەندێک لایەنی ڕێزمانی زاری فەیلی

د.تارا عەبدوڵڵا سەعید



هەولێر ٢٠١٤

# هەندێک لایەنی ڕێزمانی
# زاری فەیلی

د.تارا عەبدوڵڵا سەعید

هەولێر ٢٠١٤

* ناوی کتێب:هەندێك لایەنی ڕێزمانی زاری فەیلی.

* لێکۆڵەر: د.تارا عەبدوڵڵا سەعید.

* بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود.

* نەخشەسازی: عیسام موحسین.

* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٢٩٤).

*چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٥٢٠)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.

* ئەم کتێبە لەبنچینەدا بەشێکە لە پێویستییەکانی پلەی دکتۆرا/ فەلسەفە لە زمانی کوردیدا و لە ساڵی ١٩٩٨ پێشکێش بە زانکۆی سەلاحەدین– کۆلێژی ئاداب کراوە.

# پێشەکی

**ناونیشان و بواری نامەکە:**

نامەیەکە بۆ شیکردنەوەی چەند لایەنێکی ڕێزمانی زاری فەیلییە، بەتایبەتی لە ڕووی دیاریکردنی دەنگەکانی ئەم زارە و لایەنی مۆرفۆلۆجی و ڕستەسازی.

**گرینگی باسەکە:**

گرینگی باسەکە لەوەدایە، کە دەتوانێت کەلێنێکی بچووک لە ڕێزمانی کوردیدا پڕبکاتەوە، چونکە ئەمە یەکەم بەرهەمە بەوردی لەبارەی زاری فەیلییەوە بنووسرێت، بەڵگەم بۆ پێویستی ئەم جۆرە باسانە قسەیەکی د.فوئاد حەمە خورشیدە (٣١، ١٩٨٥) کە دەڵێت:[١] "بەشی باشووری کوردستانی ئێران (واتە هەرێمی لوڕستان) کە فەیلیش بەشێکە لەو، بە ئەنقەست لە هەموو ڕوویەکەوە پشتگوێ خراوە، بەتایبەتی لە ڕووی ڕۆشنبیری و خوێندن و ئابوورییەوە"، لە ڕووی جوگرافیشەوە ناوچەکە خۆی لە ناوچەکانی تری کوردستانەوە دوورە و تا ساڵی (١٩٣٠) ڕێگاوبانی تازەی هاتوچۆی تێدا نەبووە.[٢]

هەروەها لەلایەکی تریشەوە (فوئاد حەمە خورشید تا ڕادەیەك کەمتەرخەمی خەڵکی ناوچەکە دەخاتە ڕوو و دەڵێت: "کوردی ناوچەکە خۆیان بە تەنگەوە نەبوون بەو دیالێکتەی خۆیان فێری خوێندن بن، میللەتی کوردیش بەگشتی کەمتەرخەمی تێدا کردووە و خوێندنی تێدا تەنیا بە فارسی ماوەتەوە و نووسین و بڵاوکردنەوەش بەو دیالێکتە لەناوچووە".

ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی، کە ڕۆشنبیری فارسی بیگاتێ و کاری زمانەوانی

خۆی تێدا بکات و ڕۆشنبیری کوردی تێدا لە کزی بدات و لێی بکشێتەوە و دیالێکتی لوڕیش بدا لە دوو. هەروەها مەزهەبی ناوچەکە بەگشتی شیعەن. کاربەدەستانی ئێران بۆ مەبەستی سیاسی و ئاینی خۆیان و بزرکردنی هەستی نەتەوایەتی شیعەگەرییان بەکارهێناوە بۆ ڕاکێشانیان بەلای فارسیەتییەوە.

**سنووری باسەکە:**

لێکۆڵینەوەکە لەبارەی زاری فەیلی، یان لوڕەکانی ناوچەی ناوەڕاست و خواروی عێراقە، کە بەغدا و کوت و عەمارە دەگرێتەوە بێجگە لە ناوچەکانی بەدرە و جەسان و مەندەلی و شارەبان و هەندێ لە عەشیرەتەکانی شاری خانەقین، کە سەرووی بەغدان. ئەمانە هەموویان بە ڕەچەڵەک دەگەڕێنەوە بۆ هۆزە کۆچکردووەکانی ناوچەی (ئەرکەوان) لە لوڕستانی بچووک لە ئێراندا.

**ناوەڕۆک:**

هیچ شتێکی ئەوتۆ لەبارەی ڕێزمانی شێوەی فەیلییەوە تا ئێستا پێشکێش نەکراوە. ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ دەستکردن بە شیکردنەوەی هەندێ لایەنی ڕێزمانی ئەم زارە. لە پێشەکی و دوو بەش پێکدێت:

لە پێشەکییەکەدا ئەم بابەتانە خراونەتە ڕوو:

١. کورتەیەکی دابەشکردنی جوگرافی زارە کوردییەکان بۆ دیاریکردنی شوێنی زاری فەیلی لە ناویاندا.

٢. لێکۆڵینەوە لە نەژادی وشەی فەیلی.

٣. دیاریکردنی فۆنیمەکان لەم زارەدا.

هەرچی بەشی یەکەمە: لەبارەی مۆرفۆلۆجی زاری فەیلییە و ئەم بابەتانە دەخاتە ڕوو:

١. یاساکانی دارشتنی وشەکانی ئەم زارە بەهۆی پێشگر و پاشگرەوە دەخاتە ڕوو.
٢. دەمکاتەکانی کار و پێوەندییان بە ڕاناوە لکاوەکانەوە ڕوون دەکاتەوە.
٣. (بوون) و (هەبوون) و تایبەتییەکانیان لەم زاراوەدا بە دیار دەخات.

بەشی دووەم: یاساکانی سینتاکسی زاری فەیلی دەخاتە ڕوو بەپێی پێکهاتنی فرەیزی (phrase structural rules)، ئەم لایەنانە دەگرێتەوە:

١. فرەیزی ناوی و یاساکانی دارشتنی ئەم جۆرە فرەیزە.
٢. فرەیزی کاری و یاساکانی دارشتنی ئەم جۆرە فرەیزە.
٣. گۆڕینی ڕستەی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار.
٤. گۆڕینی ڕستەی کار تێنەپەڕ بۆ ڕستەی کار تێپەڕ.
٥. ناکردن لە ڕستەدا.

## گیروگرفتی نامەکە

لەماوەی ئامادەکردنی ئەم نامەیەدا ڕووبەڕووی چەند گرفتێك بوومەوە لەوانە:

پابەندبوونم بە ئەرکی وانە ووتنەوەوە، ئەمە بێگومان کاتێکی زۆری دەبرد، لەکاتێکدا، کە کارەکە پێویستی بە خۆتەرخانکردن و سەفەرکردن هەبوو.

لەبەرئەوەی کارەکە، لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە، پێویستی بە پێوەندیکردنی ڕاستە و خۆ هەیە لەگەڵ قسەکەرانی ئەم زارە، کە بنەچەیان لە ئێراندایە، پێویستم بە سەفەرکردن هەبوو بۆ ئەو ناوچانە، بەڵام بەداخەوە لەم ڕووەوە هیچ یارمەتی و هاوکارییەکم لە عەمادەی کۆلێجی ئاداب و سەرۆکایەتی زانکۆ و ئەنجومەنی وەزیران نەبینی لەگەڵ ئەوەشدا، کە هەموو

ئـەو لایەنانـە ڕەزامەنـدیان پیشـاندابوو بەرانبـەر هەڵبـژاردنی بابەتەکـە و هەمووشیان کادری زانستی و خاوەن بڕوانامەی بەرزن و دەزانن لێکۆڵینەوەی مەیدانی چی پێویستە.

دەیتاکان:

لەم کـارەدا پـەنا براوەتـە بـەر هەنـدێك سەرچـاوەی گشـتی، کـە بـەپێی پێڕەوە نوێیەکان پێوەندی بـە چۆنییەتی شـیکردنەوەی زمانـەوە هەیـە، بـۆ نموونـەکانیش پـەنا براوەتـە بـەر تێبینییـەکانی لێکۆڵـەر و لەلایـەن چـەند کەسانێکی خاوەن زارەکە ساغ کراونەتەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشـە ژمـارەی گشتی سەرچاوەکان کەمە.

ئەو بەڕێزانەش کە لەم ڕووەوە پشتیان پێ بەستراوە ئەمانەن:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١. سەعدوون عەبدوڵڵا شەڤی | ١٩٥٢ | (سیەسیاه) | مەندەلی |
| ٢. سەعدوون قاسم | ١٩٥٤ | (شیروانی) | بەغدا |
| ٣. داری ساری خەیدەر | ١٩٢٦ | زەڕباتییە | |
| ٤. محەمەد بەدری | ١٩٣٧ | بەدرە | |
| ٥. جەلیل محەمەد عەلی | ١٩٤٣ | (ئەرکەوان) | خانەقین |
| ٦. سامی فەیلی | ١٩٤٦ | بەغدا | |
| ٧. سەلوا داود | ١٩٦١ | (قەیتول) | مەندەلی |
| ٨. مەدحی مەندەلاوی | ١٩٥٠ | (قەرەلووس) | مەندەلی |

## دەستنیشانکردنی شوێنی جوگرافی زاری فەیلی:

ئـەوەی تــا ئێسـتا دەسـتمان کـەوتووە، یەکـەم سەرچـاوە لـەبارەی دابەشــکردنی زارەکــانی زمــانی کــوردی (شــرفنامە)ی بەدلیســییە، کــە بەشێوەیەکی ساکار باسی لە تـیرە و دیالێکتـەکانی زمـانی کـوردی کـردووە، میللەتی کوردی بەسەر چوار تیرە دابەش کـردووە (کرمـانج و لـوڕ و گـۆران و زازا)[٣].

(تۆفیــق وەهــبی) بــیروڕای (شــرفخانی) شــیکردۆتەوە و دیالێکتــە بچووکەکانی دیاری کردوەوە[٤] ئەمە ڕەنجی ساڵەهای ساڵی (تۆفیـق وەهـبی) بووە. لـە مەیـدانی زمـانی کوردیـدا بەتایبـەتی ئـەو زنجـیرە وتارانـەی کـە لـە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوی کردوونەتەوە بەناوی (بنج و بناوانی زمانی کوردی).

لە ساڵی (١٩٥١) پوختەی کارەکانی لەبارەی زارەکانی زمانی کوردی لـە کتێبی (ئەشکەوتەکەی گوندۆک) بڵاوکراوەتەوە[٥] کە بەم جۆرەیە:



کرمانجی شمالی: (شمال) ئەریڤان، قارس، ئەرزنجان، ئەرزڕۆم، مەلاتییە، مەرعەش، ئەسکەندەرونە.

(جنوبی) گۆلی وان بە درێژایی زێی گەورە، ڕووباری دجلە.

کرمانجی جنوبی: (شمال) گۆلی وان، بە درێژایی زێی گەورە، ڕووباری دجلە.

(جنوب) کرماشان، خانەقین، ڕووباری دجلە.

لوڕی: (شمال) سلطان آباد، دولت آباد، کرماشان، خانەقین، ڕووباری دجلە.

(جنوب) شیراز، کازەرونە، نزیك خەلیجی فارس.

گۆرانی: لە خەتی سنە کرماشان بەرەو ڕۆژئاوا، لە هەندێ دێهاتی نزیك سنووری عێراق و ئێران قسەی پێ دەکرێ.

زازایی: لە هەندێ ناوچەی ولایەتەکانی ئەرزڕۆم، خەرپوت، بتلیس، دیاربەکردا قسەی پێ دەکرێت.

ئەم دابەشکردنەی (تۆفیق وەهبی) بووەتە بەردی بناغە بۆ لێکۆڵینەوەکانی دواتر، وەك مامۆستا (د.جەمال نەبەز) لە (زمانی یەکگرتووی کوردی)دا، بەم شێوەیە زمانی کوردی دابەش کردووە:(٦)

أ- دوو شێوە بنچینەییەکە:

١. کرمانجی ژووروو: (زارەکانی بۆتانی، جزیرەیی، هەکاری، بادینانی، ئاشیتەیی، بایەزیدی) دەگرێتەوە.

٢. کرمانجی نێوەڕاست: (زارەکانی سلێمانی، موکری، سنەیی، ئەردەڵانی، کەرکووکی، گەرمیانی، هەولێری، سۆرانی، شاربازێڕی) دەگرێتەوە.

ب- دوو شێوە لاتەنیشتەکە:

١. كرمانجی ژێرو: (كه زارەكانی فەیلی، كرماشـانی، لـەكی، كـەڵهووڕی، خانەقینی، هەندێ لەو زارانەی بەشێوەی (لوڕی) لـە قەڵـەم دەدرێـن) دەگرێتەوە.

٢. كۆمەڵەی شێوەی گۆرانی– زازایی:

گـۆران (كـە زارەكـانی هـەورامان، ناوچـەی زەنگەنـە، زاری ناوچـەی كاكەییەكان لە كەركووك) قسەی پـێ دەكـەن (كـە (ماچۆ) شـی پـێ دەڵێن) دەگرێتەوە.

زازا (ناوچـەكانی ئەلـەزیز، دێرسـیم، خـەربوت، مەعدن و ناوچـەكانی دیاربـەكر، قولـب، هێنـە، پـیران، چێرمووك و لـە ئورفـە سـیوێرەك) دەگرێتەوە.

بەشێوەیەكی گشتی زارەكانی زمانی كوردی دەكرێت بە چوار بەشـەوە، هەندێكیان گرینگترن لەوانی تر لە ڕووی ژمارەوە.(٧)

١. كرمـــانجی (كـــوردی) ژورو. (بایەزیـــدی، هـــەكاری، بۆتـــانی، شەمدینانی،...تاد).

٢. كرمـانجی ناوەڕاسـت (مـوكری، سـۆرانی، ئـەردەلانی، سـلێمانی، گەرمیانی،...تاد).

٣. گۆران و زازا.

٤. كرمانجی خواروو. (لـوڕی، لـەكی، كـەڵهڕی، بـەختیاری، مامەسـەنی، فەیلی،...تاد).(٨)

دەبێـت تێبـینی ئـەوە بكرێـت كـە ئـەم لێكۆڵینەوەیـە لـەبارەی زاری فەیلییەوەیە، وەك لەو دابەشبوونەی سـەرەوەدا دەردەكـەوێت، بەشـێكە لـە كرمانجی خواروو، بەڵام هەندێكی تر لوڕییان كردووە بـە دوو بەشـەوە: لـوڕی گەورە و لوڕی بچووك بۆ نموونە: بە بـاوەڕی فوئـاد حەمـە خورشـید(٩) لـوڕی بچووك كـە بـە فـەیلی لـوڕ ناویـان دەبـات ئـەم لقانـەی لـێ دەبێتـەوە [لـوڕی

ڕەسەن، بەختیاری، مامەسەنی، کۆهگلۆ، لەك، کەڵهڕ] بۆچوونەکەی من زیاتر لەگەڵ ئەو دابەشکردنەی پێشتردا دەگونجێت، کە زاری فەیلی بە یەکێك لە زارەکانی کرمانجی خواروو، یان لوڕ دادەنرێت. لێرەدا بە پێویستی دەزانم، کە هەوڵی ئەوە بدەم ئەو ناوچانە دیاری بکەم کە بە زۆری زاری فەیلی تێدا بەکار دێت. لەم ڕووەوە (زبیر بیلال)[10] دەڵێت: لوڕستان دەکەوێتە هەرێمێکی شاخاوییەوە لە خوارووی هەمەدان (ئەکبەتانە)ی کۆن، کە بنکەی هەرێمی ماد بوو. لوڕ یەکێکە لە نەوەکانی کورد، ڕووبارەکانی ئەم ناوچە شاخاوییە بە تایبەتی ڕووباری کارونی سەروو، خاکەکەیان کردووە بە دوو بەشەوە، لوڕی گەورە لە باشوورەوە، لوڕی بچووك لە باکوورەوە. بەلای هەندێك لە زاناکانەوە لوڕی گەورە بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ فارس. هەرچی لوڕی بچووکە لە سەدەی شازدەهەمی زایینەوە ناوی لوڕستان لە ناوچەکەیان نراوە، یان پێی وتراوە لوڕی فەیلی. کە ناوچەکانی (پیش کوه)ی ڕۆژهەڵاتی شاخەکانی (کبیر کوه) و (پشتکوه)ی ڕۆژئاوای هەمان شاخ دەگرێتەوە، لە سنووری عێراقیشدا زاری فەیلی لە ناوچەکانی [مەندەلی، بان میل، هەندێ عەشیرەتی خانەقین، بەدرە، بەغدا، کوت، ناسریە، بەلەدروز، قۆڕەتوو، چەمچەقەڵ، کانی خاسان، تەفرەقە، مەڵەك شاه، شارنو، کێودی، چلەیی، جەسان][11] بەکاردێت.

## وشەی فەیلی لە کوێوە هاتووە؟

پێشتر وشەی فەیلی (کوردە فەیلییەکان)یان، بە هەموو خەڵکی پشتکۆ و ئیلام دەگوت، بەڵام ئەمڕۆ ئەم وشەیە تەنیا بە کوردەکانی ناوچەی ناوەڕاست و خوارووی عێراق و ناوچەکانی دراوسێی ئێران دەگوترێت، هەروەها ئەو کوردە دەرکراوانەی عێراق کە ڕیشە و ڕەگەزی خۆیان زۆرتر لە ناوچەکانی ئیلام و پشتکۆ (ناوچەی ئەرکەوان) یان دانیشتووانی ناوچەی لوڕستانی بچووکن. دواجار هەندێك کەس وای دادەنێن، کە ناوچەکانی نێوان

ئێـــران و عێـــراق و هێڵـــی ســـنووری نێـــوان هـــەردوو وڵات هـــی کـــوردە فەیلییەکانە.[12] چونکە کوردە فەیلییەکان ئێستا هەر لەم ناوچەیەدا دەژین.

لەبارەی وشەی فەیلی چەند بۆچوونێکی جیاجیا هەیـە، کـە لـە ڕاسـتیدا هیچیان بە بۆچوونی زانستی دانانرێن لەبـەر نـەبوونی بەڵگـەی بـەهێزن ئێمـە لێرەدا تەنیا ئەو بۆچوونانە دەخەینە ڕوو، کە زیـاتر ڕێـی تێدەچێت، یـەکێك لەو بۆچوونانەش:

لـــە زاری هەنـــدێك لـــە فەیلییەکانـــەوە دەڵـــێن گوایـــە پـــاش شـــەڕی سەفەوییەکان ژمارەیـەکی زۆر لـە کوردەکـانی ناوچـەی ئـیلام ڕایـان کـردووە لەگەڵ والییەکەیان کـە فـارس بـووەو نـاوی عـەلی بـووە، بـەرەو بەغـدا و لـەو جێگەیەش جێگیر بوون و پێیان وتـون (فئـە علـی)، ئـەم نـاوە بەرەبـەرە لـە ئـەنجامی بـەکارهێنانی زۆرو بەسەرچـوونی کـات، چـەند دەنگێکـی سـواوە و (فەیلییـەکانیش دەنگـی / ع / بـە / ئـ / دەدرکێـنن)، بـووە بـە (فئـە ألی)... (فەیلی).

زاراوەی فەیلی هەروەك (زبێر بیلال) لـە گۆڤـاری زاگرۆسـدا ئامـاژەی بـۆ دەکات، لە مێژووی پێش سەدەی (١٦)ی زایینی بوونی نەبووە و زاراوەیـەکی نوێیە.[13]

هەرچی (دکتۆر تاهیری)یە لە بۆچوونێکی تردا دەڵێت:

زۆر ڕێگـای تێدەچێت[14] کـە وشـەی فـەیلی بـە عـەرەبی بـووی وشـەی (پەهلی) یان (پەهلەای) فارسی، کە ناوی ناوچەیەکە لە (زەڕین ئـاوا — زریـن آباد)ە، بە دەسـت هاتبێـت. چـونکە دەنگـی /پ/ لـە نـەژاددا بـەکارهاتووە و دەنگـی /ف/ جێگـای ئـەوی گرتۆتـەوە وەك لـە وشـەی (پـاریس) کـە ئـەمڕۆ بووەتە (فارس). یان بە هەمان ڕێگا لە وشەی (پیلی)یەوە، بـە واتـای (دلێـر، ئازا، جەنگاوەر) کە لە زمانی فارسییەوە وەرگیراوە.

ئەوەی ئاشکراشە فەیلییەکان لە ڕووی مەزهەبـەوە هـەموویان شـیعەن و لـە ڕووی شـێوە و ڕوخساریشـەوە لـە کوردەکـانی تـری پارچـە جیاجیاکـانی کوردستان جیاوازن.[15]

**فۆنیمەکانی (زاری فەیلی):**

لەم لیستەیەدا فۆنیمەکانی زاری فەیلی ڕیزکراون... پاشان بزوێن و نەبزوێنەکان لە یەکتر جیاکراونەتەوە:

| جووت وشە | فۆنیمەکان | فۆنیمی تازە | ژمارە |
|---|---|---|---|
| پووش، پووک، پوڵ | ش، ک، ڵ | ش، ک، ڵ | ٣ |
| پیت، پیپ، پیس | ت، پ، س | ت، پ، س | ٣ |
| سوور، دوور | س، د | د | ١ |
| ئاو، داو، ناو | ئـ، د، ن | ئـ، ن | ٢ |
| بەو، دەو، چەو | ب، د، چ | چ | ١ |
| دان، دین | ا، ی | ا، ی | ٢ |
| ئاخ، داخ، شاخ، باخ | ئـ، د، ش، ب | ب | ١ |
| باك، باڵ، بات، باج | ك، ڵ، ت، ج | ج | ١ |
| دار، بار، عار، غار | د، ب، ع، غ | ع، غ | ٢ |
| زاڵ، باڵ، داڵ، فاڵ | ز، ب، د، ف | ز، ف | ٢ |
| گژ، بژ | گ، ب | گ | ١ |
| جاڕ، جار، جام، جان، جاو | ڕ، ر، م، ن، و | ڕ، ر، م، و | ٤ |
| حەوش، کەوش | ح، ك | ح | ١ |
| قاز، باز | ق، ب | ق | ١ |
| شەر، لەر، فەر، کەر | ش، ل، ف، ك | ل | ١ |
| هێوەت، مێوەت | ه، م | ه | ١ |
| دار، کار، ژار | د، ك، ژ | ژ | ١ |
| جان، خان | ج، خ | خ | ١ |
| داو، دەو | ا، ە | ە | ١ |
| چوو، چو | وو، و | وو، و | ١ |
| ڤنگە، زەنگە | ڤ، ز | ڤ | ١ |

وەسفی پێکهاتنی واژە لە زاری فەیلیدا بریتییە لە (٢٧) پیتی بێ دەنگ و (٧) پیتی دەنگدار بێجگە لە دوو دەنگی / ی / و / و / کە نیمچە بزوێنن. باسی بێ دەنگ و دەنگدارەکانی ئەم زارە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**فۆنیمە بێ ژێیەکان[١٦]:**

١- / پ / p : داخراو، دوولێوی، بێ ژێ

پەڕ

پەند

گەپ

٢- / ب / b : داخراو، دوولێوی، ژێدار

باد

بەی

نایاب

٣- / ت / t : داخراو، ددانی، بێ ژێ

تفەنگ

ئەترەش

کورت

٤- / د / d : داخراو، ژێدار، ددانی

دروو

مردگ

سەرد

٥- / ک / k : داخراو، بێ ژێ، مەلاشووی نەرمی

کەڕ

واکیش

هەرەسەناک

٦- / گ / g : داخراو، ژێدار، مەلاشوویی

گووش

لەگن

هەرچگ

٧- / ق / q : داخراو، ژێدار، مەلاشووی ڕەق

قەشەنگ

لەق لەق

شەق

٨- / ئـ / ? : داخراو، بێ ژێ، قوڕگی(١٧)

ئەگەر

ئسلام

٩- / ف / f : خشۆك، بێ ژێ، لێوددانی

فاڵ

سفیاو

ساف

١٠- / ڤ / v : خشۆك، ژێدار، لێوددانی(١٨)

ڤنگە

/ ع / (١٩) :

عەزاو

عەرەو

عەنگور

١١- / غ / (*) x :

غەریو

غورروەت

غەم

١٢- / س / s : خشۆك، بێ ژێ، ددانی

سایه

قسیه

کیس

١٣- / ز / z : خشۆك، ژێدار، ددانی

زام

رزیاگ

قاز

١٤- / ش / s : خشۆك، بێ ژێ، پووکه مەڵاشوویی

شادی

رشك

فاش

١٥- / ژ / z : خشۆك، ژێدار، پووکه مەڵاشوویی

ژار

دوژمن

دژ

- / ح / : تەنیا لە وشـە عەرەبییـەکان دایـە، کـە قسـەکەرانی ئـەم زارە وەریـان گرتـووە، بـەڵام درکانـدنی وەك عەرەبـەکان نییـە، بەڵکو لە شێوەی / ھ / دایە وەك: حساو، حاشا

١٦- / خ / x : خشۆك، بێ ژێ، مەڵاشووی نەرمی

خایە

بەخت

باخ

١٧- / ه / h : خشۆك، بێ ژێ، قورگی

هامشوو

نەهات

ئەم دەنگە لە کۆتایی وشەدا نایەت.

١٨- / چ / c : شەکاوە، بێ ژێ، پووکە مەڵاشوویی

چاخ

بوچگ

هوچ

١٩- / ج / j : خشۆك، ژێدار، پووکە مەڵاشوویی

جاچك

بوج

تانج

٢٠- / م / m : کەپوویی، ژێدار، دوولێوی

مێوەت

دەماوەر

سیم

٢١- / ن / n : کەپوویی، ژێدار، پووکی

نوخان

لانە

شون

٢٢- / ل / l : لازمانی، ژێدار، پووکی[٢٠]

لەچەر

پەلامار

کەل

٢٣- / ڵ / l : لازمانی، ژێدار، پووکی بە مەلاشوویی کراو

ئەلاژیا

ڕوڵە

ئەم دەنگە لە سەرەتای وشەدا نایەت.

٢٤- / ڕ / r : ددانی، ژێدار، تاك لەرە

زرپە

زور

هەرگیز ئەم دەنگە لە سەرەتای وشەدا نایەت.

٢٥- / ڕ / r : ددانی، ژێدار، لەرزۆك

ڕچیاگ

زیڕگ

قڕ

هەردو نیمچە بزوێنی / ی / y - / و / w لە زۆر لە نموونەکانی پێشتر دیاری کراون.

ئەمەش چەند نموونەیەکی تر:

/ ی / مەلاشوویی، ژێدار:

یار

نووسیان

کەی

/ و / لێوی، ژێدار:

مێوەت

ورسگ

وەراوەر

**فۆنیمە ژێدارەکان:**

١- / ی / i : پێشی زمان، بەرز[٢١]

یخ

تیر

کزی

٢- / ێ / e : پێشی زمان، ناوەند

هێستر

هاوڕێ

دوێت

٣- / ا / a : پێشەوەی زمان، نزم

سا

سارا

٤- / و / u : پشتەوەی زمان، بەرز

کوت

ناخون

کورا

٥- / و / u : پێشی زمان، بەرز[٢٢]

موش

چو

٦- / وو / o : پشتەوەی زمان، ناوەند

گووترە

دروو

٧- / ـە / a : پێشەوەی زمان، نزم

گەورا

لووقە

**چەند تێبینییەك:**

- هەموو فۆنیمە ژێدارەكان لە سەرەتای وشەدا نایەن.
- دەنگی / ب / بەشداری دەكات لە پێكهاتنی زارەكەدا، بەڵام لەلای هەندێك لە عەشیرەتەكانی وەك قەیتول، مەڵەك شاه دەبێت بە / و / وەك لەم وشانەدا دەردەكەوێت:

| | |
|---|---|
| با | وا |
| باران | واران |
| بەرامبەر | وەراوەر |
| بەهار | واهار |

- هەموو لامێكی لاواز / ل /، لەو وشانەدا، كە لە زمانێكی بێگانەوە هاتووەتە ناو ئەم زارەوە بە تایبەتی زمانی عەرەبی، دەبێتە لامی قەڵەو / ڵ / وەك لەم نمونانەدا:

| | |
|---|---|
| جبل | جەوەڵ |
| شكل | شكڵ |
| قتل | قەتڵ |
| كمال | كەماڵ |

- لەم زارەدا، دەنگی / د / لە هەندێك شوێندا دەگۆڕێت بە / ی / وەك لە:

| | |
|---|---|
| ئادەم | ئایەم |
| قەدرێ | قەیرێ |
| مەیدان | مەیان |

# بەشی یەکەم
# مۆرفۆلۆجی

**چاوگ:**

چاوگ لە ڕووی ڕۆنانەوە دوو جۆرە:

**یەکەم:** چاوگی سادە: وەك شكیان، بردن، كەفتن، كردن.

**دووەم:** چاوگی ناسادە:

أ. چاوگی لێكدراو: وەك سەركردن، باڵدان، سەرگرتن.

ب. چاوگی داڕێژراو: وەك ئەڵكردن، تێكردن، هاتنەوە، نیشتنەوە.

ج. چاوگی ئاوێتە: وەك دەسپێكردن، چەولەچەو بڕین، پڕكردنەوە.

**یەکەم:** پێنج جۆر چاوگی سادە هەیە بەپێی دواپیتی كاری سادەی ڕابردوو دەستنیشان دەكرێن:

١. چاوگی ئەلفی (أ): (كاری ڕابردوو + ن): ڕمیان، دان، چقیان.

٢. چاوگی تائی (ت): (كاری ڕابردوو + ن): كوشتن، كەوفتن، گرتن.

٣. چاوگی دالی (د): (كاری ڕابردوو + ن): كردن، مردن، خواردن.

٤. چاوگی واوی (و–گ): (كاری ڕابردوو + ن): چون – چگن، بوون – بووگن.

٥. چاوگی یائی (ی): (كاری ڕابردوو + ن): واین، ساین، فڕین، سڕین.

**دووەم:** چاوگی ناسادە: چاوگی ناسادەش سێ جۆرە:

١. چاوگی لێكدراو: چاوگی لێكدراویش چەند جۆرێكی هەیە.

أ. (ناو + چاوگی سادە):

سەردان، تریوەهاتن، دەمکردن، چەوبڕین.

ب. (ئاوەڵناو + چاوگی سادە):

پاککردن، ڕەهاکردن، گەورابوون.

ج. (ناو + ئاوەڵناو + چاوگی سادە):

دڵسیەهبوون

٢. چاوگی داڕێژراو: چاوگی داڕێژراو بە چەند ڕێگایەك دروست دەبێت، وەك:

أ. (پێشگری ئەڵ + چاوگی سادە):

ئەڵدان، ئەڵکەفتن، ئەڵکردن، ئەڵچون (ئەڵچگن)، ئەڵماڵین.

ب. (پێشگری پێ + چاوگی سادە):

پێهاتن، پێکردن، پێچون (پێچگن).

ج. (پێشگری تێ + چاوگی سادە):

تێخستن، تێکردن، تێچوون (تێچگن).

د. (پێشگری دا + چاوگی سادە)

داکاسیان، داهاتن، داکردن، دامەزرانن.

هـ. (پێشگری دەر + چاوگی سادە)

دەردان، دەرهاتن، دەرکردن، دەرچوون (دەرچگن).

و. (پێشگری ڕا + چاوگی سادە)

راهاتن، ڕاچوون

ی. (پێشگری لێ + چاوگی سادە)

لێدان، لێگرتن، لێچوون (لێچگن)

ن. (چاوگی سادە + پاشگری (ەوە))

عاتنەوە، بردنەوە، چوونەوە (چگنەوە).

٢. چاوگی ئاوێته:
أ. (ناو + ئاوەڵناو + چاوگ) = دڵمردەبوون.
ب. (ناو + پێشگر + چاوگ) = سەر ئەڵگرتن.
ج. (ناو + پێشگر + چاوگ + پاشگر) = لائەڵکردنەوە.
د. (ناو + پێشگر + چاوگ) = ئازەوپێهاتن.
هـ. (پریپۆزیشن + ڕابردووی سادە + چاوگ) = وەدیهاتن، وەدیکردن.
و. (پریپۆزیشن + ئاوەڵکار + چاوگ) = لەژێردان.

## کار:

**یەکەم: کار بەپێی کات:**

کار لە (ز، ف)* وەك هەموو زارەکانی تری زمانی کوردی بەپێی کات دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە:

١.کاری کاتی ڕابردوو.
٢. کاری کاتی ئێستا.
٣. کاری کاتی داهاتوو.

١. کاری کاتی ڕابردوو دەکرێت بە چوار بەشەوە:
أ. ڕابردووی سادە: واتە کارەکە لە ڕابردوودا تەواو بووبێت.

- پێرار واران کەم واری. پێرار باران کەم باری.
- خەسرەو کاڕەگەی لە دەسدا. خەسرەو ئیشەکەی لە دەست چوو.
- کراسەگەم پەنج دیناری تێچگ. کراسەکەم پێنج دیناری تێچوو.

* نیشانەی (ز.ف) ئاماژەیە بۆ زاری فەیلی.

ب. ڕابـــردووی بـــەردەوام: واتـــە کارەکـــە لـــە ڕابـــردوودا و ماوەیـــەکی خایاندووە.

- وەختی هاتم پەسا جنگ شوردن.

کاتێك هاتم هێشتا جلیان ئەشت.

- هێمان منالەیل وازی کردن ت لە خەوا هاتی.

هێشتا منداڵان یاریان ئەکرد تۆ لە خەو هەستای.

ج. ڕابـــردووی تـــەواوی نزیـــك: واتـــە کارەکـــە لـــە ڕابـــردوودا ڕوویـــداوەو کاریگەری تا کاتی قسەکردن ماوە.

- کی وی وەشوانیان. (کێ بوو بە شوانیان.)
- سەگ زگم ئەڵدڕییە. (سەگ سکی هەڵدڕیوم.)

د. ڕابردووی تەواوی دوور: کارەکە لە ڕابردوودا بووە پێش کارێکی تر.

- وەختێ زوراو هاتە دی توبا شو کردوی.

کاتێ زۆراب لە دایك بوو توبا شووی کردبوو.

- هێمان کەس نەخفتووێ، خودادا هاتەو.

هێشتا کەس نەنوستبوو خوداداد هاتەوە.

٢. کاری کاتی ئێستا: ئەو کارەیە، کە ڕوودانی لەگەڵ قسەکردندایە:

- ئەوە چە کەید؟ ئەوە چی دەکەیت؟

٣. کـــاری کـــاتی داهـــاتوو: واتـــە دەربـــڕینی کردەیـــەك کـــە لـــە داهـــاتوودا ڕوودەدات.

- سوو چمەو. سبیەینێ دەڕۆمەوە.
- ساڵی تر نەخوانەواری لە کوردستان نیەمینێد.

ساڵێکی تر نەخوێندەواری لە کوردستان نامێنێت.

دووەم: کار لە ڕووی هێزەوە:

کار لە ڕووی هێزەوە لەم زارەدا دابەش دەکرێتە سەر دوو جۆر:

١.کاری تێپەڕ: ئەو کارەیە کە پێویستی بە بەرکارێك، یان زیاتر هەیە.

أ. کاری تێپەڕ کە یەك بەرکار وەردەگرێت، وەك:

| | |
|---|---|
| • کتاوی سەنم. | کتێبێکم کڕی. |
| • زوراو باخەگەی فریەتێد. | زۆراب باخەکەی دەفرۆشێت. |
| • کی قاپیەگە وەسا؟ | کێ دەرگاکەی داخست؟ |
| • وەختی من هاتم ئەو بارداگرتووی. | کاتێك من هاتم ئەو باری داگرتبوو. |

ب. ئەو کارە تێپەڕەی کە زیاتر لە یەك بەرکار وەردەگرێت ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، وەك:

| | |
|---|---|
| • پوڵەگە بدە وە براگەی. | پارەکە بدە بە براکەی. |
| • بەشەگەی خوەی دا وە شەماڵ. | بەشەکەی خۆی دا بە شەماڵ. |

٢. کاری تێنەپەڕ: ئەو کارەیە کە بۆ تەواوکردنی واتای پێویستی بە بەرکار نییە، وەك:

| | |
|---|---|
| • گەوهەر هاتگە. | گەوهەر هاتووە. |
| • قژی سەری ڕزیاگە. | قژی ڕزیوە. |
| • وا ئەڵکرد. | بای هەڵکرد. |

کاری تێنەپەڕیش دوو جۆرە:

١. تێنەپەڕی ئاسایی: کە بکەر بە تەواوی بە ویستی خۆی بەو کارە هەڵدەستێت.

| | |
|---|---|
| • فەرهاد ئەڕا بازاڕ چو. | فەرهاد چوو بۆ بازاڕ. |
| • قوباد لە شوانی دانیشتا. | قوباد وازی لە شوانی هێنا. |

٢. تێنەپەڕی ڕوودان: ئەو کارەیە کە بەبێ ویستی بکەر ڕوودەدات.

• دوه شه‌و حه‌مه مرد.　　　　　دوێنێ شه‌و حه‌مه مرد.

• لاسیك كیشی تێت.　　　　　لاستیك ده‌كشێت.

### كاری بكه‌ر نادیار:

كاری بكه‌ر نادیار له‌م زاره‌دا له كاتی ڕابردوو و داهاتوودا به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه‌یه:

١. له كاری كاتی ڕابردوودا وه‌ك ئه‌م نموونانه: خوریا، كریا، ده‌ڵه‌ك دریام، كوشریا، هاوریاگه، ئه‌لگریامه، ئاگادار كریاین، شه‌كه‌ت كریاوی.

٢. بۆ كاتی داهاتوو: ده‌ڵه‌ك دریه‌م، ده‌ركرێین، سێنرێت.

بۆ یاساكانی داڕشتنی بكه‌ر نادیار له كاتی ڕابردوو و داهاتوودا سه‌یری فره‌یزی كاری بكه له به‌شی دووه‌مدا.

### بوون و هه‌بوون:

#### چاوگی هه‌بوون:

پێشگری (هه) ده‌چێته سه‌ر (بوون) و ده‌بێته (هه‌بوون)، له‌گه‌ڵ ڕاناوی لكاودا چه‌مكی هه‌یی ده‌گه‌یه‌نێت. له كاتی ڕانه‌بردوودا به‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌یه:

| | | |
|---|---|---|
| من، مه | | م |
| ته | | ت |
| ئه‌و | هه‌س | ی |
| ئیمه | | مان |
| ئیوه | | تان |
| ئه‌وان، ئوان | | یان |

| | | |
|---|---|---|
| من، مه | | م |
| ته | | ید |
| ئه‌و | دیر | د |
| ئیمه | | ین |
| ئیوه | | ین |
| ئه‌وان، ئوان | | ن |

به‌لام له کاتی ڕابردوودا به‌م جۆره‌یه:

| | | |
|---|---|---|
| من، مه | داشت | م |
| ته | | ید |
| ئه‌و | | ـ |
| ئیمه | | یمن |
| ئیوه | | ین |
| ئه‌وان، ئوان | | ن |

له حاڵه‌تی ناکردندا:

چاوگی هه‌یی له حاڵه‌تی ناکردندا له ڕووی وه‌رگرتنی ڕاناوی که‌سییه‌وه جیاوازه له حاڵه‌تی نه‌رێ به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه:

| | | |
|---|---|---|
| من، مه | نیه‌س | م |
| ته | | د |
| ئه‌و | | ی |
| ئیمه | | مان |
| | | تان |
| ئه‌وان، ئوان | | یان |

| | | |
|---|---|---|
| من، مه | نه‌یر | م |
| ته | | ید |
| ئه‌و | | د |
| ئیمه | | یمن |
| ئیوه | | ین |
| ئه‌وان، ئوان | | ن |

| | | |
|---|---|---|
| من، مه | نه‌داشت | م |
| ته | | ید/ یت |
| ئه‌و | | Ø |
| ئیمه | | یمن |
| | | ین |
| ئه‌وان، ئوان | | ن |

| | | ڕاناوە کەسی جودا | ئێستا | | | | ڕابردوو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | هەس | | دێر | | داشت | |
| | | | ئەرێ | نەرێ | ئەرێ | نەرێ | ئەرێ | نەرێ |
| تاك | ١ | مە | هەسم | نیەسم | دیرم | نەیرم | داشتم | نەداشتم |
| | ٢ | تە | هەست | نیەست | دیرید | نەیرید | داشتید | نەداشتیت |
| | ٣ | ئەو | هەسی | نیەسی | دیرد | نەیرد | داشت | نەداشت |
| کۆ | ٤ | ئێمە | هەسمان | نیەسمان | دیریمن | نەیرین | داشـــتی من | نەداشـــتی من |
| | ٥ | ئێوە | هەستان | نیەستان | دیرین | نەیرن | داشتین | نەداشتین |
| | ٦ | ئوان | هەسیان | نیەسیان | دیرن | نەیرن | داشتن | نەداشتن |

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە:

١. ئەو کۆمەڵە ڕاناوە لکاوەی لەگەڵ (هەس)دا دەردەکەوێت گرووپی (B)یە (م – ت – ی – مان – تان – یان) کە لە لاپەڕە ( ) دا ڕوون کراوەتەوە، جیاوازە لەگەڵ کۆمەڵەی (A) کە لەگەڵ (دیر)دا دەردەکەوێت (م، ید، د، یمن، ین، ن) هەروەها جیاوازیشە لەگەڵ ئەو گرووپەی کە لەگەڵ (داشت)دا هاتووە (م، ید، Ø، یمن، ین، ن).

٢. ناتوانرێت کاتی ڕابردوو لەگەڵ ڕانەبردوو بە هەمان واتا لە هەمان چاوگ وەربگیرێت بۆیە ڕانەبردوو لە چاوگی هەبوون وەردەگیرێت بەڵام ڕابردوو لە چاوگی (داشتن)ی فارسییەوە وەردەگیرێت بێگومان ئەمەش کاری خزمایەتی و نزیکی هەردوو زمانی فارسی و کوردییە لەسەر ئەم زارە دەرکەوتووە.

**بوون وەك نیشانەی كات:**

ڕستە دوو جۆرن... جۆرێكیان ئەوانن كە كارێكی تەواویان هەیە و كارەكە واتای بەجێهێنانی ئەركێك بەدەستەوە دەدات. جۆرەكەی تر ئەوانەن كە هەندێك جار بە ڕستەی ناوی، یان ڕستەی كاری (بوون) ناودەبرێت.

(بـوون) لـەم جـۆرە ڕسـتانەدا دەوری دەسـت نیشـانكردنی كـات دەبینێت[٢٤].

یەكێك لە جیاوازییە هەرە دیارەكانی ئـەم دوو جـۆرە ڕسـتەیە لـە ڕووی كاتەوە ئەوەیـە... ڕسـتەی كـاری بـوون سـێ كـاتی هەیـە (ڕابـوردو، ئێسـتا، ئایندە).

ڕەگی ڕابوردوی (بوون) كە (بی)ە كاتە ڕابوردوەكە دەستنیشان دەكات:

| | | |
|---|---|---|
| مه | | م |
| تن | | یت/ ید |
| ئه‌و | شەكەت (نە) ویـ | — |
| ئیمه | | یمن/ یم |
| ئیوه | | ین |
| ئوان | | ن |

بۆ كاتی ئایندە ڕەگی ئێستای ئەم كارە بەكاردەهێنرێت:

| | | |
|---|---|---|
| مه | | م |
| تن | ئە | یت/ ید |
| ئه‌و | شەكەت [   ] و | — |
| ئیمه | نی | یمن/ یم |
| ئیوه | | ین |
| ئوان | | ن |

بۆ كاتی ئێستا له كه‌سی سێیه‌می تاكدا نه‌بێ، هیچ نیشانه‌یه‌ك بۆ كات نییه (unmarked)

| | | |
|---|---|---|
| مه | | م |
| تن | | یت/ ید |
| ئه‌و | هه | یه |
| ئیمه | | یمن/ یم |
| ئیوه | | ین |
| ئوان | | ن |

هه‌ندێك له یاساكانی داڕشتنی وشه‌ی داڕێژراو:

## پێشگر و پاشگر:

ا. **پێشگر** ( Prefix ):

پێشگره‌كان له زاری فه‌یلیدا ئه‌مانه‌ن:

١.پێشگری ب– :

ئه‌م پێشگره له‌گه‌ڵ ڕه‌گی كاردا ئاوه‌ڵناو پێكده‌هێنێت:

پێشگری (ب–) + ڕه‌گی كار = ئاوه‌ڵناو

ب + كوش = بكوش

ب + مر = بمر (زامه‌گه‌ی بمر نییه.)

برینه‌كه‌ی كوشنده نییه.

پێشگری (ب–) + ڕه‌گی كار = ناوی بكه‌ر

ب + خوه‌ر = بخوه‌ر

ب + زه‌ن = بزه‌ن

ب + وڕ = بوڕ (بکوش و بوڕ هەر خوەیە)

بکوژ و ببڕ هەر خۆیەتی.

٢. پێشگری (مە–):

(مە–) + ڕەگی کار = ناوی بکەر

(مە) + خوەر = مەخوەر

(مە) + مر = مەمر (مەمر هەر خوداس)

٣. پێشگری (نە–):

(نە–) + ڕەگی کار = ئاوەڵناو

(نە) + مر = نەمر

(نە) + زووك = نەزووك

(نە) + زان = نەزان

پێشگری (نە–) + ناو = ناو

(نە) + دارایی = نەدارایی

(نەدارایی سەر ئایەم کێگە ماڵ دوژمنە و.)

نەبوونی وا لە مرۆڤ دەکات ڕوو لە ماڵی دوژمن بکات.

(نە) + خوەنەداری = نەخوەنەداری

٤. پێشگری (بی–):

(بی–) + ناو = ئاوەڵناو

(بی) + دەرەتان = بی دەرەتان

(بی) + فەڕ = بی فەڕ

(بی) + شەرم = بی شەرم

٥. پێشگری (نا–):

پێشگری (نا–) + ناو = ئاوەڵناو

(نا) + ڕەوا = ناڕەوا

(نا) + پیاگ = ناپیاگ

(نا) + کەس = ناکەس

(نەگیر ئەڕا مردگ، نەڕەنج ئەڕا ناکەس.)

بۆ مرد و مەگری، بۆ ناکەس بەچە مەڕەنجێ.

٦. پێشگری (با−):

پێشگری (با−) + ناو = ئاوەڵناو

(با) + دین = بادین

(با) + ئیمان = بائیمان

(با) + ڕەوشت = بارەوشت

(با) + خودا = باخودا

٧. پێشگری (نەو−): لەوانەیە ئەم پێشگرە لە ئاوەڵناوی (نوێ)وە، وەرگیرابێت.

پێشگری (نەو−) + ئاوەڵناو = ناو

(نەو) + جوان = نەوجوان

پێشگری (نەو−) + ناو = ئاوەڵناو

(نەو) + نەمام = نەونەمام

(نەو) + بەر = نەوبەر

(ئاخری خێر وی، نەوبەرەی نێر وی.)

٨. پێشگری (وە−):

پێشگری (وە−) + ناو = ئاوەڵناو

(وە) + کار = وەکار

(وە) + قوەت = وەقوەت

(خەسرەو وەقوەتە.)

٩. پێشگری (ئەڵ-):

پێشگری (ئەڵ-) + چاوگ = چاوگی داڕێژراو

(ئەڵ) + چەرخانن = ئەڵچەرخانن

(وراز مل ئەڵچەرخنێ، ملی شکێگ.)

بەراز ملی بسووڕێنێ ملی دەشکێت.

(ئەڵ) + ماڵین = ئەڵماڵین

(ئەڵ) + پەڕین = ئەڵپەڕین

١٠. پێشگری (هاو-):

پێشگری (هاو-) + ناو = ناو

(هاو) + عەشرەت = هاوعەشرەت

(هاو) + سا = هاوسا

(هاو) + ماڵ = هاوماڵ (تالان بی هاوماڵ کریا.)

تالان کرا بوو بە یەك ماڵ.

١١. پێشگری (دا-):

پێشگری (دا-) + چاوگ = چاوگی داڕێژراو

(دا) + ماڵین = داماڵین

(دا) + چڕیان = داچڕیان

(ئاسارەی لە عاسمان داچڕیاگە.)

ئەستێرەی لە ئاسمان کەوتۆتە خوارەوە.

(دا) + ڕزیان = داڕزیان

١٢. پێشگری (وەر-):

پێشگری (وەر-) + چاوگ = چاوگی داڕێژراو

(وەر) + نان = وەرنان

(وەر) + گرتن = وەرگرتن

(وەر) + چەرخان = وەرچەرخان

ب. **پاشگر** ( Sufix ):

**پاشگرەکانی زاری فەیلی ئەمانەن:**

١. پاشگری (–ا):

رەگی کار + پاشگری (–ا) = ئاوەڵناو

زان + (ا) = زانا

دان + (ا) = دانا

٢. پاشگری (–ار):

رەگی رابوردو + پاشگری (–ار) = ناو

کوشت + (ار) = کوشتار (رۆژ کوشتار هاتمەو.)

رۆژی عارفە هاتمەوە.

ناو + (–ار) = ئاوەڵناو

گرفت + (ار) = گرفتار

٣. پاشگری (–ارە):

ناو + پاشگری (–ارە) = ناو

شەو + (ارە) = شەوارە

توخم + (ارە) = توخمارە

(توخمارەی حەمید = (بنەماڵەی حەمید)

٤.پاشگری (–راك):

رەگی داهاتوو + پاشگری (–راك) = ناو

خۆ + (راك) = خۆراك

(خەم خورد، خەم خۆراك، خەم مەردەنمی، خەم تەوق زنهار لە گەردنمی.)

خەم خۆر، خەم خۆراك، خەم کوشتمی، خەم بۆتە تەوق لە گەردەنمدا.

٥. پاشگری (–ناك):

ناو + پاشگری (–ناك) = ئاوەڵناو

ترس + (ناك) = ترسناك

خەتەر + (ناك) = خەتەرناك

٦. پاشگری (–اڵ):

ناو + پاشگری (–اڵ) = ناو

گەن + (اڵ) = گەناڵ

ئەڤد + (اڵ) = ئەڤداڵ

(ئیمڕو یەك ئەڤدال پووس وەکووڵی دیم وە زوور هەواڵ لەیلی پرسی لە لیم.)

ئەمڕۆ شێتکی پێست لە کۆڵم بینی بە زۆر هەواڵی لەیلای پرسی لێم.

٧. پاشگری (–انە):

ناو + پاشگری (–انە) = ئاوەڵکار

شێر + (انە) = شێرانە

کوڕ + (انە) = کوڕانە

ژن + (انە) = ژنانە

(ژنی خوازم ژنانە، پوسە بکێگ وە هەوانە.)

ژنێك دەهێنم ژنانە، پێستە بکات بە هەمانە.

ناو + پاشگری (–انە) = ئاوەڵناو

ساڵ + (انە) = ساڵانە

ڕووژ + (انە) = ڕووژانە

٨. پاشگری (–ەڵ):

ئاوەڵناو + پاشگری (–ەڵ) = ئاوەڵناو

رووت + (ەڵ) = ڕووتەڵ

ناو + پاشگری (–ەڵ) = ئاوەڵناو

گیز + (ەڵ) = گیزەڵ

(نەسرین گیزەڵە، گیز و گاز کەر وەبان سەرمانا.)

نەسرین کورتە باڵایە، ناز و فیز دەکات بە سەرمانە.

٩. پاشگری (ـوەر):

ناو + پاشگری (ـەوەر) = ئاوەڵناو

دەم + (ەوەر) = دەمەوەر

جان + (ەوەر) = جانەوەر

١٠. پاشگری (ـەمەنی):

ڕەگی ڕابردوو + پاشگری (ـەمەنی) = ناو

خوارد + (ەمەنی) = خواردەمەنی

ڕەگی داهاتوو + پاشگری (ـەمەنی) = ناو

سوز + (ەمەنی) = سوزەمەنی

١١. پاشگری (ـە):

ناو + پاشگری (ـە) = ناو

گووش + (ە) = گووشە

پەنج + (ە) = پەنجە

هەفت + (ە) = هەفتە

١٢. پاشگری (ـی):

ناو + پاشگری (ـی) = ئاوەڵناو

دووزەخ + (ی) = دووزەخی

١٣. پاشگری (ـن):

ناو + پاشگری (ـن) = ئاوەڵناو

زگ + (ن) = زگن

ڕشك + (ن) = ڕشكن

تڕ + (ن) = تڕن

١٤. پاشگری (-ووك):

ناو + پاشگری (-ووك) = ئاوەڵناو

شەرم + (ووك) = شەرمووك

١٥. پاشگری (-ەوە): واتای دووبارە بوونەوە دەگەیەنێت.

چاوگ + پاشگری (-ەوە)

چگن + (ەوە) = چگنەوە

نوسانن + (ەوە) = نوساننەوە

١٦. پاشگری (-ین):

ناو + پاشگری (-ین) = ئاوەڵناو

شەکەر + (-ین) = شەکەرین

(گاجار وەنایمن سەر ئەو یەك سەرین، گا جار گووش دامە ڕازی شەکەرین.)

یەك جار لەگەڵ ئەو سەرم بنایەتە سەر یەك سەرین، یەك جار گوێم گرت لە نهێنی شەکرئاسا.

وەفر + (ین) = وەفرین

١٧. پاشگری (-ەڵ):

ناو + پاشگری (-ەڵ) = ئاوەڵناو

ڕووت + (-ەڵ) = ڕووتەڵ

١٨. پاشگری (-گ):

ڕەگی کار + پاشگری (-گ) = ناوی بکەر

مرد + (گ) = مردگ

کرد + (گ) = کردگ

مردگی باوان چوار و پەنج و شەش

ئەو خەشواران بچوولەش لەبان لەش

یان: ناو + پاشگری (ـگ) = ناو

پووش + (گ) = پووشگ

دەس + (گ) = دەسگ

یان: کاری کارابزر + پاشگری (ـگ) = ناوی بکەر

خوریا + (گ) = خوریاگ

گەنیا + (گ) = گەنیاگ

١٩. پاشگری (ـڵە):

ناو + پاشگری (ـڵە) = ناوی گەورەکراو

دوێت + (ڵە) = دوێتڵە

برا + (ڵە) = براڵە (دوتڵە لە باوان، گلگە لە داوان)

٢٠. پاشگری (ـنەر):

ناو + پاشگری (ـنەر) = ناوی بکەر

ئاژاوە + (نەر) = ئاژاوەنەر

قویلەو + (نەر) = قویلەونەر

٢١. پاشگری (ـێر):

ناو + پاشگری (ـێر) = ناو

وەرز + (ێر) = وەرزێر

خاو + (ێر) = خاوێر

٢٢. پاشگری (ـەوا):

ناو + پاشگری (ـەوا) = ناوی بکەر

نان + (ەوا) = نانەوا

ئاوەڵکار + (ـەوا) = ناوی بکەر

پیش + (ەوا) = پیشەوا

٢٣. پاشگری (ـگەر):

ناو + پاشگری (ـگەر) = ناوی بکەر

مس + (گەر) = مسگەر

ئاسن + (گەر) = ئاسنگەر

٢٤. پاشگری (ـندە):

ڕەگی داهاتوو + پاشگری (ـندە) = ئاوەڵناو

کوش + (ندە) = کوشندە

بڕ + (ندە) = بڕندە

هەفتەیێ بکەیم ڕاو وە و قەتارەو

وە و جای کوشندەی میر شکارەو

٢٥. پاشگری (ـەکی):

ناوی شوێن + پاشگری (ـەکی) = ناو

شەو + (ەکی) = شەوەکی

بن + (ەکی) = بنەکی

دەر + (ەکی) = دەرەکی

(دەرەکی هات، بنەکی دەرکرد)

٢٦. پاشگری (ـوەن):

ناو + پاشگری (ـوەن) = ناوی بکەر

ناڵ + (وەن) = ناڵوەن

گوڵ + (وەن) = گوڵوەن

٢٧. پاشگری (ـەنی):

ڕەگی ڕابردوو + پاشگری (ـەنی) = ناو

کرد + (ەنی) = کردەنی

برد + (ەنی) = بردەنی

(کردەنی کی و، بردەنی کی!) کێ کردی، کێ بردی!

٢٨. پاشگری (–چە): بۆ بچووك كردنەوە

ناو + پاشگری (–چە) = ناوی بچووكراوە

باخ + (چە) = باخچە

خوان + (چە) = خوانچە

(بڕی ژنە، بڕی ژانە، بڕی زوال خوانچە و نانە.)

یەكێ ژنە و یەكێ ژانە، یەكێكیش تاڵی مەنجەڵ و نانە.

٢٩.پاشگری (–یڵ):

ناو + پاشگری (–یڵ) = ئاوەڵناو

چەپ + (یڵ) = چەپیڵ

ڕاس + (یڵ) = ڕاسیڵ

٣٠.پاشگری (–ووڵ):

ناو + پاشگری (–ووڵ) = ناوی بچووكراوە

زەنگ + (ووڵ) = زەنگووڵ

پرز + (ووڵ) = پرزووڵ

٣١.پاشگری (–ەوان):

ناو + پاشگری (–ەوان) = ناوی بكەر

پاس + (ەوان) = پاسەوان

باخ + (ەوان) = باخەوان

٣٢.پاشگری (–مەن):

ناو + پاشگری (–مەن) = ناوی بكەر

خێر + (مەن) = خێرمەن

هونەر + (مەن) = هونەرمەن

كار + (مەن) = كارمەن

٣٣. پاشگری (–ەکین):

ناو + پاشگری (–ەکین) = ئاوەڵناو

ئاو + (ەکین) = ئاوەکین

ڕاو + (ەکین) = ڕاوەکین

٣٤.پاشگری (–وانگ):

ناو + پاشگری (–وانگ) = ناوی ئامێر

مل + (وانگ) = ملوانگ

دەس + (وانگ) = دەسوانگ

٣٥.پاشگری (–ویلگ):

ناو + پاشگری (–ویلگ) = ناوی بچووك كراوە

جام + (ویلگ) = جامویلگ

داس + (ویلگ) = داسویلگ

٣٦. پاشگری (–لەمە)[٢٥]:

ناو + پاشگری (–لەمە) = ناو

شەكەر + (لەمە) = شەكەرلەمە

ئاوە + (لەمە) = ئاوەلەمە

٣٧. پاشگری (–گار):

ناو + پاشگری (–گار) = ئاوەڵگوزارە

شەو + (گار) = شەوگار

ڕووز + (گار) = ڕووزگار

(شەوگار شوم لە ئێوارە ەو دیارە.)

شەوی شوم لە ئێوارەوە دیارە.

٣٨. پاشگری (–چی):

ناو + پاشگری (–چی) = ناوی بكەر

ڕاو + (چی) = ڕاوچی

حومام + (چی) = حومامچی

ڕاهی بوی لە ڕا خرامانی وەست

حوری لە حومامچی قولف قاچی بەست

٣٩.پاشگری (–چیەتی):

ناو + پاشگری (–چیەتی) = ناوی پیشە

چا + (چیەتی) = چاچیەتی

خزمەت + (چیەتی) = خزمەتچیەتی

٤٠. پاشگری (–نوك):

ناو + پاشگری (–نوك) = ئاوەڵناو

ترس + (نوك) = ترسنوك

٤١.پاشگری (–ڵان):

ناو + پاشگری (–ڵان) = ناوی شوێن

قامێش + (ڵان) = قامێشڵان

مەشکە + (ڵان) = مەشکەڵان

مویش + (–ڵان) = مویشڵان

٤٢.پاشگری (–ەوار):

ڕەگی کار + پاشگری (–وەار) = ناوی کارا

خوەن + (ەوار) = خوەنەوار

ناو + (–ەوار) = ناوی کارا

ئومید + (ەوار) = ئومیدەوار

ناو + (–ەوار) + ناو

شون + (ەوار) = شونەوار

٤٣.پاشگری (-یشت):

ڕەگی داهاتوو + پاشگری (-یشت) = ناو

خوەر + (-یشت) = خوەریشت

٤٤.پاشگری (-سار):

ناو + پاشگری (-سار) = ئاوەڵناو

سەگ + (سار) = سەگسار

ناو + (-سار) = ناو

روخ + (سار) = ڕوخسار

٤٥.پاشگری (-ەر):

ناو + پاشگری (-ەر) = ناوی کارا

کووچ + (ەر) = کووچەر

جەنگ + (ەر) = جەنگەر

ناو + (-ەر) = ناو

سەنگ + (ەر) = سەنگەر

بەن + (ەر) = بەنەر

٤٦.پاشگری (-چگ):

ناو + پاشگری (-چگ) = ناوی بچووککراو

سەر + (چگ) = سەرچگ

٤٧. پاشگری (-یچگ):

ناو + پاشگری (-یچگ) = ناو

مەل + پاشگری (یچگ) = مەلیچگ

٤٨. پاشگری (-زار):

ناو + پاشگری (-زار) = ناوی شوێن

گوڵ + (زار) = گوڵزار

دڵ + (زار) = دڵزار

٤٩.پاشگری (ـەزار):

ناو + پاشگری (ـەزار) = ئاوەڵناو

شەرم + (ەزار) = شەرمەزار

٥٠. پاشگری (ـدار):

ناو + پاشگری (ـدار) = ناوی داڕێژراو

ماڵ + (دار) = ماڵدار

دوکان + (دار) = دوکاندار

پوڵ + (دار) = پوڵدار

هەندێ جار / د / لەم پاشگرەدا لە شێوەی / ی / دا دەردەکەوێت لە قسەکردنی ڕۆژانەدا.

پا + (یار) = پایار

دەرد + (یار) = دەردیار

٥١. پاشگری (ـگا):

ناو + پاشگری (ـگا) = ناوی شوێن

دەس + (گا) = دەسگا

لەوەڕ + (گا) = لەوەڕگا

(دەس چوگ، دەسگا مینێگ.)

دەست ڕۆشتوو دام و دەسگای دەمێنێت.

٥٢. پاشگری (ـسان):

ناو + پاشگری (ـسان) = ناوی شوێن

کورد + (سان) = کوردسان

جەنگڵ + (سان) = جەنگڵسان

لە شێوەد نییە لەی کوردسانە

مەردانەی فرەنگ لەو سەردکانە

٥٣.پاشگری (ـکەر):

ناو + پاشگری (ـکەر) = ناوی کارا

کار + (کەر) = کارکەر

گیّای + (کەر) = گیّایکەر (سوالّکەر)

ناوجی + (کەر) = ناوجیکەر

(ئەگەر جەنگکەر وە قەدەر ناوجیکەر بزانیٚ، باوگ خوەی کیٚگە قوربانی.)

ئەگەر شەڕکەر بەقەدەر ناوبژیکەر بزانێت، باوك خۆی دەکاتە قوربانی.

٥٤.پاشگری (ـدان):

ناو + پاشگری (ـدان) = ناوی شوێن

ئاگر + (دان) = ئاگردان

نمەك + (دان) = نمەکدان

٥٥.پاشگری (ـبەر):

ناو + پاشگری (ـبەر) = ناوی کارا

رەنج + (بەر) = ڕەنجبەر

هووش + (بەر) = هووشبەر

بار + (بەر) = باربەر

خەر چش بو باربەر، ژن نیٚك بو کارکەر

٥٦. پاشگری (ـگر):

ناو + پاشگری (ـگر) = ناوی کارا

رووژگ + (گر) = ڕووژگگر

فالّ + (گر) = فالگر

(ئەوەگ لە دز بمینیٚگە و فالگر بەیگەی.)

ئەو لە دز بەجیٚ دەمیٚنیٚ فالّچی دەیبات.

٥٧. پاشگری (–کار):

ناو + پاشگری (–کار) = ناوی کارا

گوناه + (کار) = گوناهکار

شەو + (کار) = شەوکار

ئاوەڵناو + پاشگری (–کار) = ئاوەڵناوی داڕێژراو

بەد + (کار) = بەدکار

٥٨. پاشگری (–باز):

ناو + پاشگری (–باز) = ناوی کارا

قومار + (باز) = قومارباز

قوش + (باز) = قوشباز

ناو + پاشگری (–باز) = ئاوەڵناوی داڕێژراو

فێڵ + (باز) = فێڵباز

حقە + (باز) = حقەباز

٥٩.پاشگری (–وو):

ناو + پاشگری (–وو) = ناو

ریش + (وو) = ریشوو

ناو + پاشگری (–وو) = ئاوەڵناو

تڕ + (وو) = تڕوو

## ڕاناوەکان لە زاری فەیلیدا:

لە (ز، ف)دا لە ڕووی واتـاوە دەشـێت ڕانـاو بەسـەر ئـەم چـەند جـۆرەی خوارەوەدا دابەش بکرێت:

١. ڕاناوی کەسی:
أ. ڕاناوی کەسی جودا.
ب. ڕاناوی کەسی لکاو.
٢. ڕاناوی نیشانەکردن.[٢٦]
٣. ڕاناوی خۆیی.

### ١. ڕاناوی کەسی:

أ. ڕاناوی کەسیی جودا: لە (ز، ف)*دا یەك دەسـتە ڕانـاوی کەسـی جـودا هەیە، بۆ دەستنیشانکردنی شـێوە و ئـەرکی ئـەو ڕاناوانـەش سـەیری ئەم نموونانە بکە:

١. ئەو خورماگەتن خوەیدەی، مە وەجنگەکەی وازی کەم[٢٧]
(ئەو خورمایەی تۆ دەیخۆیت، من بە دنکەکەی یاری دەکەم)
٢. ئەگەر من ئەو ویاتام، کی شو دالگت وی.
(ئەگەر من نەبوومایە، کێ مێردی دایکت دەبوو)
٣. مە کوردیگم، منیش کوردم.
(من کوردێکم، منیش کوردم.

لەم نموونانەی سەرەوەدا دەردەکەوێت ڕاناوی جودای یەکـەمی تـاك دوو قاڵبی هەیە (مە) و (من)... شـیکردنەوە دەری دەخـات ئـەم جیاوازییـە هـیچ ئەرکێکی ڕێزمانی نییە... (لەوانەیە فۆنۆلۆجی بێت)، چـونکە هـەردوو شـێوە لە حاڵەتی بکەری و بەرکاریدا دەردەکەون.

بۆ ڕاناوی جودای کەسی دووەمی تاك سـەیری ئـەم نموونانـەی خـوارەوە بکە:

١. ت له جەماڵ خووتەری.

تۆ له جەماڵ باشتریت.

٢. ئەگەر تە یە منی، مە هەزار مەنم بیجگە لە ساق و گەردنم.

(ئەگەر تۆ یەك كەسی، من هەزار كەسم بێجگە لە لاق و گەردنم.)

٣. دەرد تن لە من و دەرد من لە زەوو.

(دەردی تۆ لە من و دەردی من لە زەوی)

٤. تنیش جور مەردم كار بكە.

(تۆش وەك خەڵكی ئیش بكە)

ئەوەی لە نموونەكاندا دەردەكەوێت ڕاناوی جودای كەسی دووەمی تاك دوو قاڵبی هەیە (ت، تن)... ئاشكرایە كە ئەم دوو قاڵبە جیاوازە هیچ ئەركێكی ڕێزمانی نییە، چونكە هەردوو شێوە لە حاڵەتی بكەری و بەركاریدا دەردەكەون، تەنیا ئەوەندە هەیە لە ڕووی مۆرفۆلۆجیەوە كە (ت) بە بەشێكی ترەوە بلكێت وەك دەنگی /ش/ لە ڕستەی (٤)دا، ڕێك ناكەوێت، بۆیە دەچێتە شێوەی (تن)ەوە.

بۆ دیاری كردنی ڕاناوی جودای كەسی سێیەمی تاك بڕوانە ئەم نموونانە:

١. ئەو چە داشت؟ ئەو چی هەبوو؟

٢. من قەڵەمەگە دام وە ئەو.

هەرچی كەسی یەكەمی كۆیە، سەیری ئەم نموونانە بكە:

- ئیمە لە ئوان فریەتریم. ئێمە لە ئەوان زۆرترین.
- یمە لە ناو خانگەكە نیشتیمن. ئێمە لە ناو خانووەكەدا دانیشتووین.
- ئیمەی ژن بی بەشیم. ئێمەی ژن بێ بەشین.
- وەختی ئیمە هاتبیم ئوان ئەڵسیاوین. كاتێك ئێمە هاتین ئەوان هەڵسابوون.

لەم نموونانـەدا دەرکـەوت کـە ڕانـاوی کەسـی یەکـەمی کۆ لـە بکـەری و بەرکاریدا لە شێوەی (ئیمە) و (یمە)دا دەردەکەوێت.

بۆ کەسی دووەمی کۆ سەیری ئەم نموونانە بکە:

- ئیوه هیمان ساواین! — ئێوە جارێ منداڵن.
- یوه لە کوو، ئوان لە کوو؟ — ئێوە لە کوێ و ئەوان لە کوێ؟
- ئیوه چە کارەین؟ — ئێوە چ کارەن؟
- ئیمە و ئیوه قەومیم. — ئێمە و ئێوە خزمین.

لە نموونەکاندا بۆمان دەرکەوت کـە ڕانـاوی کەسـی دووەمـی کـۆ لـە دوو شێوەدا دەردەکەوێت (ئیوه) و (یوه) لە بکەری و بەرکاریدا.

ڕاناوی کەسی سێیەمی کۆ، لەم نموونانەدا ببینە:

- ئوان کین؟ — ئەوان کێن؟
- ئیمە و ئوان بە پشتیم. — ئێمە و ئەوان لە یەك پشتین.
- تا ئوان هاتنە و من خەفتم. — تا ئەوان هاتنەوە، من نوستم.

ڕاناوی کەسی سێیەمی کۆ لە یەك شێوەدا دەردەکەوێت چ لە بکـەری و چ لە بەرکاریدا.

ب. ڕاناوی کەسیی لکاو:

١. (م) کەسی یەکەمی تاك: هاتم، چگم، بخەفم.

(هاتم، چووم، بنوم)

- ئەڕایە پوڵ دام تا کوڕم لە ماڵەیل نەخەفێگ. (بۆیـــە پـــارەم دا، تاکو کوڕم لە ماڵان نەنوێت)
- ترسم بمرم لە لیم بچد زور، زرەی خاك و بێڵ زەینم بکەد کوور.
- ئەگەر بویمە وەوی، زانم چون نیشم. (ئەگـەر ببمـە بـووك دەزانم چۆن ڕەفتار دەکەم.)

٢. (ی، ید، یت) کەسی دووەمی تاك: (شەرم بکردای، گردید، چریت)

(شەرمت بکردایە، کردت، بانگت کرد)

- تا نەکیشی جەفا، نیە دونی صەفا. (تا ماندوو نەبیت، خۆشی نابینیت.)
- لەم دی کاول بیە دانیشتگی چەکەی؟[٢٨] (لەم دێیە کاول بووە دانیشتووی چی دەکەیت؟)
- میرزا ژن خیزانم وەت: ئەی کارە خەتاس میرزا نەکەی بکەید.

(میرزا ژنی خێزانم وتی: ئەم کارە هەڵەیە، نەکەیت بیکەیت.)
- تو کە مردنت چارەی ئیران کەیت کارەت هەر ئیدەن، توران و یران کەیت[٢٩]
- ئەویت وەکارمەن و لەپشت میز قەشەنگی کارکەیت.

(دەبیت بە فەرمانبەر و لەپشت مێزی جوان ئیش دەکەیت.)

ڕاناوی لکاوی کەسی دووەم لە سێ شێوەدا دەردەکەوێت وەك لە نموونەکانی سەرەوەدا دەبینین.

٣. ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك لەم زارەدا شاراوەیە، لە دەمی ئێستای خەبەری و ئینشائی دا (ێ) دەلکێنرێت بە ڕەگی کارەوە کە بەلای هەندێ زمانەوانەوە ئەمە ڕاناوی لکاوە، بەڵام کاتێك بەراورد دەکرێت لەگەڵ ڕاناوی کەسی یەکەم و دووەمی کۆدا لە دۆخی بەرکاردا، ئەم (ێ)یە ئاوا دەبێت وەك لەم نموونەیەدا:

| | |
|---|---|
| خوەد : ئەخوات | بخوەد : بخوات |
| دەود : ڕائەکات | بدەود : ڕابکات |

- ئارد پیەنگ وە تێوڵە و نیەوسیگ.

(ئاردی پیانگ بە ناوچەوانیەوە ناوەستێت.)
- ئاگر بکە فێگە و تەڕ و وشك نەیریگ.

(ئاگر بکەوێتەوە، تەڕ و وشکی لە لا نییە.)

٤. (یم، یمن) ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ:

دەویم : ڕام کرد　　　　دەویمن : ڕامان کرد

بکردایم : بم کردایە　　　　بکردایمن : بمان کردایە

رەوبکەیم : ڕاو بکەین　　　　رەوکەیمن : ڕاو دەکەین

• خودایە کەی ڕەها بیم لە دەس ئێ زاڵمە.

(خوایە کەی ڕزگاربم لە دەست ئەم زۆردارە.)

• خوسەداری کردیمن.　　　　(خەفەتباری کردین).

ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ لە دوو شێوەدا دەردەکەوێت وەك لە نموونەکانی پێشودا دەرکەوت.

٥. (ین) ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ:

چگین : چووین　　　　بچیاتاین : بچووینایە

دەوین : ڕامان کرد　　　　بجەنگین : بجەنگن

بواین : هەڵ بێن

ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ تەنیا لە یەك شێوەدا دەردەکەوێت.

٦. (ن) ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆ: شەوارەکردن، ڕەوکردن.

• ئوشی سیفیگن و بویەوە دوو کوتەو.　　　　(دەڵێی سێوێکن و کراون بە دووکەرتەوە).

• دوو ڕێوی لە یە کونا دەرچگن، ئەگەکە　　　　(دوو ڕێوی لە کونێك دەرچوون، ئەمیان بەوی تریانی وت:

وە ئەوەگە وەت: هارە گێت سەن.　　　　بۆ کوێ دەچێت).

ڕاناوە جوداو لکاوەکانی شێوەی فەیلی لەم نەخشەیەدا بەپێی کەس و ژمارە، ڕوونکراوەتەوە:

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | A1 | A2 | B |
| تاك | ١ | من / مە | م | م | م |
| | ٢ | تن / تە | یت / ید* | یت / ید | ت |
| | ٣ | ئەو | Ø | د | ی |
| کۆ | ١ | ئیمە | یمن / یم | یمن / یم | مان |
| | ٢ | ئیوە / ئوە | ین | ین | تان / دان |
| | ٣ | ئوان / ئەوان | ن | ن | یان |

- لە کاتی قسەکردنی ئاساییدا لەبەر ئاسانی گۆکردن / ت / دەبێت بە (د).

٢. ڕاناوەکانی نیشانەکردن بەپێی جۆرەکانی لەم نەخشەیەدا ڕوونکراوەتەوە:

| | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| نزیك | ئەیە / یە | ئەیانە |
| دوور | ئەوە | ئەوانە |

١. ئەیە / یە: بۆ کەسی نزیکی تاك و شتی نزیك:

- ئەیە چەس؟ (ئەمە چییە؟).
- یە ماڵمانە. (ئەمە ماڵمانە).
- یە کوڕیگە. (ئەمە کوڕێکە).

٢. ئەوە: کەسی دووری تاك و شتی دوور:

- ئەوە چەکوس کەفتگیکە. (ئەوە چ کۆست کەوتوویەکە.)
- ئەوە سواریگە. (ئەوە سوارێکە).

٣. ئەیانە / یانە: کەسی نزیکی کۆ و شتی نزیك:

- ئەیانە قەومن. (ئەمانە لە خزمن).
- یانە لە چە هوزیگن. (ئەمانە لە چ بنەچەیەکن.)
- ئەیانە منالْ ئیمەن. (ئەمانە منداڵی ئێمەن.)

٤. ئەوانە: کەسی دووری کۆ و شتی دوور:

- ئەوانە دوێتن. (ئەوانە کچن).

ئەوانە کە لە تەك گیـان و ڕوحـی واژە و وێـژە و وردەکـاری زاراوەی لـوڕی دا ناسیاون.[٣٠]

٣. ڕاناوەکانی تەمەلوك (ز، ف) بـەپێی کـەس و ژمـارە لـەم نەخشـەیەدا ڕوونکراوەتەوە:[٣١]

| ژمارە | کەس | ڕاناوی تەمەلوك |
|---|---|---|
| تاك | ١ | م |
| | ٢ | ت / د |
| | ٣ | ی |
| کۆ | ١ | مان |
| | ٢ | تان / دان |
| | ٣ | یان |

- دڵم بڕیاگە. (دڵم پچڕاوە.)
- داڵگم کەڵهڕییە. (دایکم کەڵهووڕە).
- ماڵت هالە کوو؟ (ماڵت لە کوێیە؟)
- کی شایەتدە. (کێ شاهێدتە.)
- دەسی خوەش بود. (دەستی خۆش بێت.)

- ئومیدی ها وه کوڕەگانی. (پشتی به کوڕەکانی بەستووه.)
- ماڵمان ها لەی هەنازه. (ماڵمان لەم لایەیه.)
- دەسان خوەش بود. (دەستان خۆش بێت.)
- کاردان چونه؟ (ئیشتان چۆنه؟)
- کاریان خووه. (ئیشیان باشه.)
- دڵیان شکیاس. (دڵیان شکاوه.)

٤. ڕاناوه خۆییەکانی (ز، ف) لەم نەخشەیەدا بەپێی کەس و ژماره ڕوونکراوەتەوه:

| ژماره | کەس | ڕاناوی خۆیی |
|---|---|---|
| تاك | ١ | خوەم |
| | ٢ | خوەت<br>خوەد |
| | ٣ | خوەی |
| کۆ | ١ | خوەمان |
| | ٢ | خوەتان<br>خوەدان |
| | ٣ | خوەیان |

- خوەم وه خوەمم کرد. (خۆم به خۆمم کرد.)
- وه کوچك ئەژنووی خوەت شکنید، (به بەرد ئەژنۆی خۆت دەشکێنی، پەشیمان دەبیتەوه.)
پەشیمان ئەویتەو.

- وه قه‌وڵ كوردی يوشن: كوچك له (به قسه‌ی كوردی ده‌ڵێن: به‌رد له جێی خۆی سه‌نگینه.)
جییه‌ی خوه‌ی سه‌نگینه.
- يه‌ماڵ خوه‌مانه. (ئه‌مه ماڵی خۆمانه.)
- به‌شه‌گه‌ی خوه‌تان بوه‌ن. (به‌شه‌كه‌ی خۆتان ببن).
- ئيوه به‌ين خوه‌دان بسازين. (ئێوه له نێوان خۆتان ڕێك بكه‌ون.)
- خوه‌يان زانن. (خۆيان ده‌زانن.)

هه‌موو جۆره ڕاناوه‌كانی (ز، ف) له‌م نه‌خشه‌یه‌دا ڕوون كراوه‌ته‌وه:

| ژماره | | جود | | لكاو | | | نيشانه‌كردن | | بوون | | خۆيی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١ | ٢ | ١ | ٢ | ٣ | | | | | | |
| تاك | ١ | من | مه | م | | | | | م | | خوه‌م | |
| | ٢ | تن | ته | يت/يد/ی | | | | | ت | د | خوه‌ت | خوه‌د |
| | ٣ | ئه‌و | | Ø | د | | ئه‌يه‌يه | ئه‌وه | ی | | خوه‌ی | |
| كۆ | ١ | ئيمه/ايمه | | يمن/يم | | مان | | | مان | | خوه‌مان | |
| | ٢ | ئيوه | | ين | | تان | | | تان | دان | خوه‌تان | خوه‌دان |
| | ٣ | ئوان | | ن | | يان | ئه‌يانه | ئه‌وانه | يان | | خوه‌يان | |

# بەشی دووەم

# سینتاکس

## ڕێزمانی ڕاناو لە زاری فەیلیدا:

١. ڕاناوی جودا: ڕاناوی جودا لە (ز، ف)دا یەك دەستەیە وەك لە لاپەڕە (٤٠) ڕوون کراوەتەوە.

٢. ڕاناوی لکاو: ڕاناوی لکاو لە (ز، ف)دا دوو دەستەیە وەك لە لاپەڕە (٤٢) ڕوونکراوەتەوە.

- کلتان کەیم. (دەتان نێرین.)
- کلمان ئەکردن. (دەتان ناردین.)

ئەم دوو ڕستەیە لە قالّبی وشەیەکدا داڕێژراون هەردووکیان بریتین لە (بکەر) و (بەرکار) و (کار). بکەر و بەرکار تێیاندا بە ڕاناوی لکاو دەربڕاون.

- ڕستەی یەکەم — کاتەکەی داهاتووە.
- ڕستەی دووەم — کاتەکەی ڕابردووە.

دیارە گۆڕینی کاتی کارەکە بووە بە هۆی ئالّوگۆڕکردنی ڕۆڵی (بکەر) و (بەرکار).

لە زاری فەیلیدا بکەر و کار لە کەس و ژمارەدا ڕێك دەکەون، واتە بکەر لە چ کەس و ژمارەیەکدا بێت، کارەکەش ڕاناوی لکاوی سەر بە هەمان کەس و ژمارە وەردەگرێت، ڕاناوە جودا و لکاوەکانیش لەم زارەدا بەپێی کەس و ژمارە وەك لە لاپەڕە (٤٣) ڕوون کراونەتەوە.

جۆر و کاتی کار ڕۆڵ دەگێڕن لە هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاودا (مەبەست لە جۆری کار تێپەڕ و تێنەپەڕە، کاتیش ڕابردوو ڕانەبردووە).

چۆنیەتی دەرکەوتنی ڕاناوی لکاو لەگەڵ کاردا بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.




**نەخشەی ژمارە (٢)**

ئەگەر کارەکە لە ڕابردووی تێپەڕدا بوو، کۆمەڵی ($A_1$) وەردەگرێت. (ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک Ø).




ئەگەر کارەکە لە ڕابردووی تێنەپەڕدا بوو، بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەردا دیسان کۆمەڵەی ($A_1$) وەردەگرێت کە (کەسی سێیەمی تاک Ø)ە.




هەروەها ئەگەر کارەکە لە داهاتوودا بوو، تێپەڕ بێت، یان تێنەپـەڕ ئـەوا کۆمەڵەی ($A_2$) وەردەگرێت، کە لە کەسی سـێیەمی تاکدا ڕانـاوی لکـاوی (د) دەردەکەوێت.






بۆ هەڵبـژاردنی ڕانـاوی لکـاو بـۆ دەربـڕینی ڕێکـەوتن سـەیری نەخشـەی ژمـارە (٢) دەکـەین، بـەپێی کـات و جـۆری کارەکـە کۆمەڵەکـە دەستنیشـان دەکەین و پاشان بەپێی کەس و ژمـارەی بکەرەکـە و بـە یارمـەتی نەخشـەی ژمارە (١) ڕاناوەکان دەدۆزینەوە، بۆ نموونە:

- ئیمە کل کرد–                (ئێمە نارد–)

(کـل کـرد) کـە ڕەگـی ڕابـردووە و تێپـەڕە بـەپێی نەخشـەی ژمـارە (٢) ڕاناوی لکـاوی پێویسـتە لـە کۆمەڵـەی ($A_1$) وەربگرێـت، (ئیمـە) کـە بکـەرە، کەسی یەکەمی کۆیـە، بەرانبەرەکـەی لـە نەخشـەی ژمـارە (١)دا (یمـن)ە بـە ڕەگی کارەکەوە دەلکێنرێت و ڕستەکە دەبێت بە:

- ئیمە کل کردیمن.          (ئێمە ناردمان.)

هەروا لە:

- ئەوان خەف–              (ئەوان دەنو–)

(خەف) ڕەگی داهاتووی (خەفتن)ە، لە ڕووی جۆرەوە تێنەپەڕە، بەهۆی نەخشەی ژمارە (٢) ڕانـاوی لکـاو دەبێـت لـە ($A_2$) وەربگیرێـت. (ئـەوان) کـە بکـەری ڕسـتەکەیە، کەسـی سـێیەمی کۆیـە و بـەپێی نەخشـەی ژمـارە (١) بەرامبەرەکەی (ن)ە، ڕستەکە دەبێت بە:

- ئەوان خەف–ن             (ئەوان دەنو–ن)

ئەم ڕانـاوە لکاوانـە بێجگـە لـە ڕۆڵـی بکـەری ڕۆڵـی بـەرکاریش دەبیـنن، بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و ناوی خاوەن دەشێت بـە ڕانـاوێکی لکـاو جێگیر بکرێن:

١. ئەگـەر کـاری ڕسـتە داهـاتوو بـوو، ئـەو ڕانـاوەی کـە ڕۆڵـی بـەرکار دەبینێت دەکەوێتە کۆتایی داڕشتنی کارەکەوە و پێویسـتە ڕانـاوێکی لکاوی لە گرووپی (B) بەپێی کەس و ژمارەی بەرکارەکە بۆ دابنێین. (بڕوانە یاسای ژمارە (١))

ئەو کارە داهاتووەی کە بەرکاری کراوە بە ڕاناوی لکاو ←—— ڕەگی کاری داهاتوو + ڕاناوی لکاو (بۆ بکەر) گرووپی (A) + (ـە)[٣٤] + ڕاناوی لکاو (بۆ بەرکار) گرووپی (B)

**یاسای ژمارە.... (١)**

وەك لە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | تن | | | دونمەت | (دەتبینم) |
| من | ئەو | دوین | م | دونمەی | (دەیبینم) |
| | ئیوە | | | دونمەتان | (دەتانبینم) |
| | ئەوان | | | دونمەیان | (دەیانبینم) |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| من | | | | دونیدەم | (دەم بینیت) |
| تن | ئەو | دونی | یت/ید | دونیدەی | (دەی بینیت) |
| | ئیمە | | | دونیدەمان | (دەمان بینێت) |
| | ئەوان | | | دونیدەیان | (دەیان بینیت) |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| من | | | دونیدەم | (دەم بینێت) |
| | تن | | دونیدەت | (دەی بینێت) |
| ئەو | ئەو | دونی...ێ...د | دونێد | (دەی بینێت) |
| | ئیمە | | دونێدەمان | (دەمان بینێت) |
| | ئیوە | | دونیدەتان | (دەتان بینێت) |
| | ئەوان | | دونیدەیان | (دەیان بینێت) |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئیمه | تن | دونی | ن | دونینەت | (دەت بینین) |
| | ئەو | | | دونینەی | (دەی بینین) |
| | ئیوه | | | دونینەتان | (دەتان بینین) |
| | ئەوان | | | دونینەیان | (دەیان بینین) |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئیوه | من | دونی | ین | دونینەم | (دەم بینن) |
| | ئەو | | | دونینەت | (دەت بینن) |
| | ئیمه | | | دونینەمان | (دەمان بینن) |
| | ئەوان | | | دونینەیان | (دەیان بینن) |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەوان | من | دونی | دونینەم | (دەم بینن) |
| | تن | | دوننەت | (دەت بینن) |
| | ئەو | | دوننەی | (دەی بینن) |
| | ئیمه | | دوننەمان | (دەمان بینن) |
| | ئیوه | | دوننەتان | (دەتان بینن) |
| | ئەوان | | دوننەیان | (دەیان بینن) |

٢. ئەگەر کاری ڕستە ڕابردوو بوو، ئەو ڕاناوە لکاوەی کە دەوری بەرکار دەبینێت هەر لە گرووپی (B) دەبێت و لە کۆتایی داڕشتنەکەشەوە دەبێت. بڕوانە یاسای ژمارە (٢).

ئەو کارە ڕابردووەی کە بەرکارەکەی کراوە بە ڕاناوی لکاو ← ڕەگی کاری ڕابردوو + ڕاناوی لکاو بۆ بکەر گرووپی (A) + (ـە) + ڕاناوی لکاو بۆ بەرکار گرووپی (B)

## یاسای ژماره.... (۲)

وەك لە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | تن، ته | | | خواردمەت | (خواردمیت) |
| من، مه | ئەو | خوارد | م | خوارد | (خواردم) |
| | ئیوه | | | خواردمەتان | (خواردمن) |
| | ئەوان، ئوان | | | خواردمەیان | (خواردمن) |
| | | | | | |
| | مه | | | خواردیدەم | (خواردتم) |
| تن | ئەو | خوارد | یت/ید | خواردیت | (خواردت) |
| | ئیمه | | | خواردیدەمان | (خواردتین) |
| | ئەوان | | | خواردیدەیان | (خواردتن) |
| | | | | | |
| | مه | | | خواردەم | (خواردمی) |
| | تن | | | خواردیت | (خواردتی) |
| ئەو | ئەو | خوارد | Ø | خواردەت | (خواردی) |
| | ئیمه | | | خواردەمان | (خواردینی) |
| | ئیوه | | | خواردەتان | (خواردنی) |
| | ئەوان | | | خواردەیان | (خواردنی) |
| | | | | | |
| | تن | | | خواردینەت | (خواردمانیت) |
| ئیمه | ئەو | خوارد | ین | خواردینەی | (خواردمان) |
| | ئیوه | | | خواردینەتان | (خواردمانن) |
| | ئەوان | | | خواردینەیان | (خواردمانن) |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | من | | | خواردینەم | (خواردتانم) |
| ئیوه | ئەو | خوارد | ین | خواردینەی | (خواردتان) |
| | ئیمه | | | خواردینەمان | (خواردتانین) |
| | ئەوان | | | خواردینەیان | (خواردتانن) |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | من | | | خواردنەم | (خواردیانم) |
| | تن | | | خواردنەت | (خواردیانیت) |
| ئەوان | ئەو | خوارد | ن | خواردن | (خواردیان) |
| | ئیمه | | | خواردنەمان | (خواردمانیان) |
| | ئیوه | | | خواردنەتان | (خواردیانن) |
| | ئەوان | | | خواردنەیان | (خواردیانن) |

٣. ئەگەر کاری ڕستە فەرمان بوو، ئەو ڕاناوە لکاوەی کە دەوری بەرکار دەبینێت لە گرووپی (B)ـەو لە کۆتایی دارشتنی کارەکەوە دەبێت.[٣٥] بڕوانە یاسای ژمارە (٣)

ئەو کارە فەرمانەی کە بەرکاری کراوە بە ڕاناوی لکاو ←— نیشانەی کاری فەرمان + ڕەگی ڕانەبردوو + ڕاناوی لکاو بۆ بکەر گرووپی (A) + (ە) + ڕاناوی لکاو بۆ بەرکار گرووپی (B).

**یاسای ژمارە.... (٣)**

بکاڵەی ←—— ب + کاڵ + (ە) + (Ø)[٣٦] + (ی) (بیکێڵە)

## پێکهاتنی ڕسته له زاری فەیلیدا :

ڕسته له (ز، ف)دا، له دوو فرەیزی سەرەکی پێك دێت، فرەیزی ناوی و فرەیزی کاری، سادەترین فرەیزی ناوی له ناوێك، یان ڕاناوێك پێك دێت. فرەیزی کاری له سادەترین شێوەیدا، له ڕەگی کارێك و ڕاناوێکی لکاو پێك دێت، ڕاناوه لکاوەکه ئەرکی ڕێکەوتن دەبێت و پێوەندی نێوانیان بەم جۆرەیه[٣٧]:




## فرەیزی ناوی:

له ناوێك پێك دێت، دەشێت لەگەڵ ئەم ناوەدا ناوی تر، یان ڕاناو، یان ئاوەڵناو، یان ڕاده و ئاوەڵناوێك، یان زیاتر دەرکەوێت.




(ناو + ناو + ناو + ....)

(ناو + ڕاده + ئاوەڵناو + ئاوەڵناو + ....)

فرەیزی کاری له ئاسانترین شێوەیدا له ڕەگێك و ڕاناوێك پێك دێت:




لەگەڵ کاردا دەشێت بەرکار وەك فرەیزێکی ناوی دەربکەوێت.




بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەشێت لە دوای بەرکاری ڕاستەوخۆوە دەربکەوێت:



## فرەیزی ناوی لە زاری فەیلیدا:

ئەم ڕستانەی خوارەوە چۆنێتی دەرکەوتنی ناوێکی تەنیا وەك (ف، ن) دەردەخەن:

١. کوڕ هات.

٢. کوڕەگە هات.

٣. کوڕێگ هات.

٤. کوڕێل هاتن.

٥. کوڕەگان هاتن.

لە (ڕ١)دا، ئەو ناوەی (ف، ن) پێك دەهێنێت، ناوێکی گشتی نێرە و هیچ مۆرفیمێکی وەرنەگرتووە، بەڵام (ڕ٢) ناوەکە بەهۆی مۆرفیمی ناسیارییەوە بووە بە ناوێکی ناسراو. مۆرفیمی ناسیاریش لە (ز، ف)دا (گە، ەگە)یە بۆ نێرو مێ. ئەگەر وشەکە کۆتایی بە ڤاول هاتبو (گە) وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر کۆتایی بە کۆنسۆنانت هاتبو ئەوا (ەگە) وەردەگرێت:

ناوی ناسراو ←—— ناو + (گە، ەگە).

یاسای ژمارە .... (١)

نموونە:

- زانا + (–گە) = زاناگە
- دوێت + (–ەگە) = دوێتەگە

لە (ڕ٣)دا، ناوەکە مۆرفیمی نەناسیاری وەرگرتووە. مۆرفیمی نەناسیاری لە (ز، ف)دا بریتییە لە (یگ) بۆ نێرو مێ.

ناوی نەناسراو ←—— ناو + یگ

یاسای ژمارە .... (٢)

نموونە:

دوێت + یگ ←—— دوێتیگ

له (ڕ٤)دا، ناوه گشتییه كه مۆرفیمی كۆی وەرگرتووه، كه مۆرفیمی (ێل)ه.
ئەم مۆرفیمه دەچێته سەر ناوی نێرو مێ ی تاكی گشتی و ناوی كۆی گشتی پێك دەهێنێت:

ناوی كۆی گشتی ⟵ ناوی تاكی گشتی + مۆرفیمی كۆ (ێل).

یاسای ژماره .... (٣)

نموونه:

كوڕ + ێل ⟵ كوڕێل

بەڵام له (ڕ٥)دا، ناوەكه دوو مۆرفیمی چۆته سەر، كه مۆرفیمی ناسیاری و مۆرفیمی كۆیه، ئەویش یاسای ژماره (٤)ه.

ناوی كۆی ناسراو ⟵ مۆرفیمی ناسیاری (ەگە، گە) + مۆرفیمی كۆ (ان)

یاسای ژماره .... (٤)

- كوڕ + (ەگه) + (ان) ⟵ كوڕەگان

مۆرفیمی كۆ دوو ئەلۆفۆنی هەیه (ێل/ ن)، یەكەمیان له كاتی نەناسیاری و دووەمیان بۆ ناسیاری.

ئەوەی له یاسای ژماره (٤)دا دەردەكەوێت ئەوەیه، كه ئەگەر ناوێك لەهەمان كاتدا دوو مۆرفیمی ناسیاری و مۆرفیمی كۆ وەرگرێت ئەوا مۆرفیمی ناسیاری پێش مۆرفیمی كۆ دەكەوێت، وەك:

- دوێت + ەگه + ان ⟵ دوێتەگان[٣٨]

بەم پێیه ئەو ناوه تەنیایەی كه خۆی فرەیزی ناوی پێك دەهێنێت، دەشێت ئەم مۆرفیمانەی خوارەوەی لەگەڵ دەربكەوێت.

| ناو | مۆرفیمی ناسیاری | مۆرفیمی نەناسیاری | مۆرفیمی كۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| نێر یان مێ | -ەگه | یگ | ان |

**فراوانکردنی فرەیزی ناوی:**

ئەو ناوەی کە خۆی بەتەنیا دەتوانێت فرەیزی ناوی دروست بکات، دەشێت کەرەسەی تری زمانی لە پێشییەوە، یان لە دوایەوە بەکاربهێنرێت، بۆ ئەوەی فرەیزە ناوییەکە فراوان ببێت ئەو کاتە ناوەکە دەبێتە ناوکی فرەیزە ناوییەکە و کەرەسەکانی تریش وەك سەربار لە فرەیزەکەدا دەردەکەون. ئاوەڵناو یەکێکە لەو کەرەسانەی کە لەگەڵ ناوی فرەیزە ناوییەکەدا دێت و فراوانی دەکات.

بۆ نموونە:

١. کوڕ[٣٩] دانا هات. (کوڕی زیرەك هات.)

٢. کوڕێکی دانا هات. (کوڕێکی زیرەك هات.)

٣. کوڕە داناکە هات. (کوڕە زیرەکەکە هات.)

لە (ڕ١)دا، (کوڕ) ناوێکی گشتی تاکە بۆ نێر، تەنیا مۆرفیمی (ی) کورتی لەگەڵدا دەرکەوتووە، بۆ بەستنەوەی ئاوەڵناوەکە بە ناوەکەوە.

کەواتە: ناوی گشتی تاك (نێر، یان مێ) + (ی) + ئاوەڵناو

**یاسای ژمارە ... (١)**

لە (ڕ٢)دا، ناوەکە مۆرفیمی نەناسیاری وەرگرتووە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاوەڵناویشی لەگەڵدایە، بەڵام مۆرفیمی نەناسیاری هەر بەناوەکەوە لکاوە و مۆرفیمی بەستنەوەش لەنێوان ناو و ئاوەڵناوەکەدا مۆرفیمی (ی)ە.

ناوی نەناسراوی تاك + ئاوەڵناو

**یاسای ژمارە ... (٢)**

لە (ڕ٣)دا ناوەکە ناسراوە، بەڵام مۆرفیمەکە کە (گە)یە، چووەتە سەر ئاوەڵناوەکە. مۆرفیمی بەستنەوەش لەنێوان دیارخەر و دیارخراودا واتە ناو و ئاوەڵناوەکەی، مۆرفیمی (ە)یە.

ناوی ناسراوی تاك (گە) + ە + ئاوەڵناو (گە)

**یاسای ژمارە ... (٣)**

ئەو ناوانەی لە فرەیزە ناوییەکانی پێشودا هاتوون تاکن، هەر کاتێك ئەم ناوانە لە شێوەی کۆدا دەرکەوتن ئەوا دەبێت ئەم ناوانە لە ناوی گشتییەوە وەرگێرابن و کرابن بە کۆ، یان کۆی ناسراو بن، چونکە دوو مۆرفیمی کۆ و نەناسیاری لە فرەیزێکی پێکهاتوو لە دیارخەر و دیارخراودا دەرناکەون، لە ڕستەیەکی سادەدا بۆ ڕوونکردنەوە. سەیری ئەم نموونانەی خوارەوە بکە:

١. کوڕێل دانا هاتن. (کوڕانی زیرەك هاتن.)

٢. کوڕە داناگان هاتن. (کوڕە زیرەکەکان هاتن.)

لە (ڕ١)دا، ناوەکە گشتییە و کۆیە و ئاوەڵناوەکەش هیچ مۆرفیمێکی وەرنەگرتووە. واتە مۆرفیمی کۆ تەنیا چۆتە سەر ناوەکە و مۆرفیمی (ی) بەستنەوەش دیار نەماوە.

ناوی گشتی کۆ + مۆرفیمی کۆ (ێل) + ئاوەڵناو

**یاسای ژمارە ... (٤)**

لە (ڕ٢)دا، ناوەکە گشتییە و دیارخراوە و بەهۆی مۆرفیمی بەستنەوەی (ە) وە بەستراوە بە دیارخەرەکەوە کە ئاوەڵناوەکەیە، ئاوەڵناوەکەش هەردوو مۆرفیمی ناسیاری و کۆی بە دوای یەکتریدا وەرگرتووە.

ناوی گشتی + مۆرفیمی بەستنەوە + ئاوەڵناو + مۆرفیمی ناسیاری + مۆرفیمی کۆ

**یاسای ژمارە ... (٥)**

بەم پێیە ئەو ناوەی کرۆکی فرەیزە ناوییەکەیە، کاتێك ئاوەڵناوی لەگەڵدا دێت، ئەوا ئاوەڵناوەکە لە ڕووی حاڵەت و ژمارەوە شوێن ناوەکە

دەکەوێت، بەڵام ئەگەر فرەیزە ناوییەکە زیاتر لە ئاوەڵناوێکی لەگەڵدا هات ئەوا بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

١. کوڕ دانا و ئازا و زرنگ چو. (کوڕی زیرەك و ئازا و چالاك ڕۆیشت.)

٢. کوڕیگی دانا و ئازا و زرنگ هات. (کوڕێکی زیرەك و ئازا و چالاك هات.)

٣. کوڕە دانا و ئازا و زرنگەکە چو. (کوڕە زیرەك و ئازا و چالاکەکە ڕۆیشت.)

لە (ڕ١)دا ناوەکە، ناوێکی گشتی تاکە و چەند ئاوەڵناوێکی لەگەڵدا هاتووە ناوەکەو ئاوەڵناوی یەکەم بەهۆی (ی)ێکی کورتەوە بەیەکەوە بەستراون کە مۆرفیمی بەستنەوەیەو ئاوەڵناوەکانیش بەهۆی مۆرفیمی (و)ی بەستنەوە بەیەکەوە بەستراون.




**یاسای ژمارە ... (٦)**

لە (ڕ٢)دا، ناوەکە ناوێکی تاکی نەناسراوە و کۆمەڵێك ئاوەڵناوی بەدوادا هاتووە و بەهۆی مۆرفیمی (ی) بەستراوە بە ئاوەڵناوی یەکەمەوە هەرچی کۆمەڵە ئاوەڵناوەکەشە هەریەکەیان بەهۆی مۆرفیمی (و) وە بەوی تریانەوە بەستراوە.




**یاسای ژمارە ... (٧)**

له (ڕ٣)دا، ناوەکە ناوێکی تاکی ناسراوە و زنجیرەیەك ئاوەڵناوی بەدوادا هاتووە، ناوەکە بەهۆی مۆرفیمی (ە) وە بە ئاوەڵناوی یەکەمەوە بەستراوە و مۆرفیمی ناسیاری (ەکە)ش لەسەر ناوەکە دەگوێزێتەوە بۆ سەر دوا ئاوەڵناو و ئاوەڵناوەکانیش بەهۆی مۆرفیمی (و)وە بەیەکەوە بەستراون.




یاسای ژمارە ... (٨)

دەتوانین ئاوەڵناوەکانیش هەر بەهۆی مۆرفیمی (ــە) وە بەیەکەوە ببەستین هەر کاتێك یەکێك لە ئاوەڵناوەکان کۆتایی بە دەنگێکی بزوێن هاتبوو ئەوا مۆرفیمی (ــە) وەرناگرێت.

- دوێتە زرنگە ئازا وریاکە. (کچە زیرەکە ئازا وریاکە.)

ئەگەر ئەو ناوەی کرۆکی فرەیزە ناوییەکەیە زیاتر لە ئاوەڵناوێك بەدوایدا هاتبوو، لە داڕشتنی کۆدا بوو، ئەوا دەشێت ناوێکی گشتی، یان ناسراو بێت، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دیارە.

١. کوڕ دانا و ئازا و چەونەترسێل هاتن.

(کوڕانی زیرەك و ئازا و چاونەترس هاتن.)

٢. کوڕە داناو ئازاو چەونەترسەگان هاتن.

(کوڕە زیرەك و ئازا و چاونەترسەکان هاتن.)

له (ڕ١)دا، ناوەکە گشتییە و کۆیە، بەپێی یاسای زارەکەش ئاوەڵناوی دوای ناوەکە دەبێت مۆرفیمی کۆ وەربگرێت، بەڵام لەبەرئەوەی زنجیرەیەك

ئاوەڵناو هەیە، مۆرفیمی کۆ دەچێتە سەر دوا ئاوەڵناو و ئاوەڵناوەکانیش بەهۆی مۆرفیمی (و) بەیەکەوە دەبەسترێنەوە.




یاسای ژمارە ... (٩أ)

لە (ڕ٢)دا، ناوەکە ناوێکی کۆی گشتی ناسراوە، بەڵام مۆرفیمی کۆ و ناسیاری لەسەر ناوەکە هەڵگیراون و خراونەتە سەر دوا ئاوەڵناو لە فرەیزە ناوییەکەدا، لەم شێوە دارشتنەدا ئاوەڵناوەکان بە مۆرفیمی (و) بەیەکەوە بەستراون، ناوەکە و یەکەم ئاوەڵناویش بە مۆرفیمی (ـە) لە یەك دەدرێن.




یاسای ژمارە ... (٩ب)

تەنیا هەر ئاوەڵناو نییە کە فرەیزی ناوی فراوان دەکات، بەڵکو ڕاناوی ئیشارەتیش دەتوانێت هەمان ڕۆڵ ببینێت. ئەم ڕاناوەش لە (ز، ف)دا، ئەمانەن:

| | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| نزیك | ئەیە (یە) | ئەیانە |
| دوور | ئەوە | ئەوانە |

ئەم ڕاناوانە لە (ز، ف)دا بۆ نێر و مێ بەبێ جیاوازی بەکاردەهێنرێن. لە حاڵەتی تاك و کۆدا، بەم شێوەیەی خوارەوە فرەیزی ناوی دروست دەکەن.

١. ئەم کوڕە[٤٠]
٢. ئەو سوارە

- لە (ڕ١)دا، (یە) ڕاناوی ئیشارەتی نزیکە بۆ تاك نێر بێت، یان مێ، بووە بە دەرخەرێك و کەوتۆتە پێش ئەو ناوەوە کە ناوکی فرەیزە ناوییەکەیە.
- لە (ڕ٢)دا، (ئەوە) ڕاناوی ئیشارەتە بۆ تاکی دوور، نێر بێت، یان مێ و ڕۆڵی دیارخەری هەیە بۆ دیارخراوی ڕستەکە، کە کرۆکی فرەیزە ناوییەکەیە.

لەو نموونانەی سەرەوەدا، ئەو ناوەی کە ناوکی گرێی ناوییە و ڕاناوێکی ئیشارەتی لە پێشەوەیە، ئاوەڵناوی وەك دەرخەر لەگەڵدا نەهاتووە، ئەگەر گرێ ناوییەکە زیاتر فراوان بکەین، ئەوا دەشێت ئاوەڵناوێك، یان زیاتر لە دوای ناوە (ئیشارەت بۆ کراوەکە) وە بەکاربهێنرێت، وەك لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١. ئەو پیاگە زرنگە هات. (ئەو پیاوە زیرەکە هات.)
٢. ئەو ژنە زرنگانە هاتن. (ئەو ژنە زیرەکانە هاتن.)
٣. ئەو پیاگە زرنگ و داناو کامڵە هات. (ئەو پیاوە زیرەك و ئازا و تێگەیشتووە هات.)
٤. ئەو ژنە زرنگ و داناو کاملانە هاتن. (ئەو ژنە زیرەك و ئازا و تێگەیشتوانە هاتن.)

لە (ڕ١)دا، لە پاش ناوەکە ئاوەڵناوێك هاتووە، ئەم ئاوەڵناوە هەروەك ناوەکەی پێش خۆی پاشبەندی /ە/ وەردەگرێت، بۆیە /ە/ چووەتە سەر ئاوەڵناوی (زرنگ).

ئەی کوڕە زرنگە دڵسۆزە.

ئەو کوڕە زیرەکە دڵسۆزە.




**یاسای ژمارە ... (١٠)**

لە (ڕ٢)دا، ناوی ئیشارەت بۆ کراو (کە خۆی ناوکی گرێ ناوییەکەیە) کۆیە. ناوەکە بە تاکی دەمێنێتەوە و دەنگی /ە/ وەردەگرێت، بەڵام نیشانەی کۆ دەچێتە سەر ئاوەڵناوەکە. بڕوانە یاسای ژمارە (١١).




**یاسای ژمارە ... (١١)**

لە (ڕ٣)دا، زنجیرەیەك ئاوەڵناو بەدوای ناوە تاکە ئیشارەت بۆ کراوەکەدا هاتووە، تەنیا ناوەکە و دوا ئاوەڵنا و پاشبەندی /ە/ لە ڕاناوی ئیشارەتەوە وەردەگرن و ئاوەڵناوەکانی تر بە مۆرفیمی (و) بەیەکەوە دەبەسترێن. بڕوانە یاسای ژمارە (١٢).




**یاسای ژمارە ... (١٢)**

دەشتوانین ئەم جۆرە ڕستانە بەم شێوەیەی خوارەوە دابڕێژین.

- ئەی پیاگە زرنگە دانا و کامڵە هات.

لە (ڕ٤)دا، ناوی ئیشارەت بۆ کراو ناوێکی کۆیە و کۆمەڵێك ئاوەڵناوی بە پاشدا هاتووە و ناوەکە کۆیە لەبەرئەوە لە دارشتنی ئاخاوتنی ڕۆژانەدا تەنیا دوا ئاوەڵنا و مۆرفیمی کۆ وەردەگرێت. بڕوانە یاسای ژمارە (١٣).




**یاسای ژمارە ... (١٣)**

بۆ فراوان کردنی سنووری فرەیزی ناوی لە ڕستەدا، ژمارەش ڕۆڵی هەیە ئەگەر ژمارەکە یەك بوو، شێوەی دارشتنی ڕستەکان بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت.

١. یێ کوڕ چگ. (یەك کوڕ ڕۆیشت.)

٢. یێ دوێت زرنگ چگ. (یەك کچی زیرەك ڕۆیشت.)

٣. یێ کورِ ئازاو زرنگ و دانا چگ. (یەك کوڕی ئـازا و بـە توانـا و زیـرەك ڕۆیشت.)

وەك لە هەموو ڕستـەکاندا دەردەکـەوێت، ژمارەکـە وەك دەرخـەرێك چـووەتە پێش ناوەکەوە و پێویستی بە مۆرفیمی بەستنەوە نییـە بـۆ ئـەوەی پێـوەی گرێ بدەین، وەك لە (ڕ١)دا دیارە، دەشتوانین ئاوەڵناوێك، یـان زیـاتر لەگـەڵ ناوەکە بەکاربهێنین. یاسای دارِشتنی ڕستەکان و بەستنەوەی نـاو بـە یەکـەم ئاوەڵناوەوە و بەستنەوەی ئاوەڵناوەکان بە یەکترەوە هەروەك لـە یاسـاکانی پێشتردا هاتووە.

لـە بـەکارهێنانی نـاودا، ئەگـەر ناوەکـە لـە یـەك زیـاتر بـوو، دەبێـت نـاوە ژمێردراوەکە نیشانەی کۆ وەربگرێت بەم شێوەیە:

١. سێ پیاگ هاتن. (سێ پیاو هاتن.)

٢. سێ دوێت هاتن. (سێ کچ هاتن.)




**یاسای ژمارە ... (١٤)**

دەشێت لە دوای ناوەکەوە (ناوە ژمێردراوەکە)، ئاوەڵناوێـك، یـان زیـاتر بەکارهێنرابێت، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١. دیە کوڕێل زرنگ هاتن. (دە کوڕی زیرەك هاتن.)

٢. پەنج دوێتێل گورج و ئازاو زرنگ هاتن. (پێنج کچی گورج و ئازا و زیرەك هاتن.)

لە (ڕ١)دا، ناوە ژمێردراوەکە (کە ناوکی فرەیزە ناوییەکەیە) ئاوەڵناوێکی بەدوادا هاتووە، هەروەك ناوەکە ئەویش نیشانەی، یان مۆرفیمی کۆی وەرنەگرتووە: بڕوانە یاسای ژمارە (١٥).




**یاسای ژمارە ... (١٥)**

هەروەها لە (ڕ٢)دا، بەهەمان شێوە نە ناوە ژمێردراوەکە و نە ڕیزە ئاوەڵناوەکەی بە دوایدا هاتوون، مۆرفیمی کۆیان وەرنەگرتووە.




**یاسای ژمارە ... (١٦)**

بەڵام هەر کاتێك ڕاناوی ئیشارەت پێش ژمارە و ناوی ژمێردراو هەبوو ئەوا مۆرفیمی کۆ دەچێتە سەر ناوە ژمێردراوەکە وەك لەم نموونەیەدا:

ئەی سێ کوڕەیلە زرنگە. (ئەم سێ کوڕە زیرەکە.)

ڕاناوی ئیشارەت      ژمارە    ناوی ژمێرراو (مۆرفیمی کۆ)    ئاوەڵناو

ئەی      سێ      کوڕ (ێل)      زرنگ

Ø      Ø      ـەیل

**یاسای ژمارە ... (١٧)**

ئەگەر هاتوو ڕاناوی ئیشارەت لە پێش ناوە ژمێردراوەکەوە نەبوو، هەروەها زیاتر لە ئاوەڵناوێك بە دوای ناوەکەدا هات، ئەوا تەنیا دوا ئاوەڵناو مۆرفیمی کۆ وەردەگرێت پێش مۆرفیمی ناسیاری بەم شێوەیەی خوارەوە:

پەنج دوێتە زرنگ و دانا و ئازایلەگە.

پێنج کچە زیرەك و بە توانا و ئازاکە.

ژمارە   ناوی ژمێرراو   ئاوەڵناو   ئاوەڵناو   ئاوەڵناو   (مۆرفیمی کۆ)   مۆرفیمی ناسیاری)

پەنج   دوێت   زرنگ   دانا   ئازا   + ێل   +   گە

Ø   ـە   و   و

**یاسای ژمارە ... (١٨)**

لەگەڵ ژمارە و ئاوەڵناویشدا، ڕاناوی ئیشارەتیش دەتوانێت لە هەمان ڕستەدا لەگەڵ ئەو ناوەی کە ناوکی فرەیزی ناوییە، دەربکەوێت وەك:

- ئەو سێ پیاگە.      (ئەو سێ پیاوە.)
- ئەو سێ پیاگەیلە زرنگە.      (ئەو سێ پیاوە زیرەکە.)

ئەگەر لە دوای ناوە ژمێردراوەکەوە لە هەمان ڕستەدا، زیاتر لە ئاوەڵناوێك هات ئەوا دوا ئاوەڵناو مۆرفیمی کۆ وەردەگرێت:

- ئەو سێ پیاگە زرنگ و گورج و ئازایلە.

(ئەو سێ پیاوە زیرەك و گورج و ئازایە.)

هەرچی لە قسەی ڕۆژانەدایە، زۆرجار مۆرفیمی کۆ دەشێت بچێتە سەر ناوە ژمێردراوەکە و دوا ئاوەڵناویش، وەک:

- ئەو سێ پیاگەیلە زرنگ و گورج و ئازایلە.

ڕادەش وەک کەرەسەیەکی سەربار دەتوانێت فرەیزی ناوی فراوان بکات، ئەو فرەیزە ناوییانەی کە ئاوەڵناوێک، یان زیاتریان تێدایە دەتوانن ڕادە لە پێش ئاوەڵناوەوە، وەربگرن لێرەشدا گرینگ نییە ئەو ناوەی کە ناوکی فرەیزی ناوییە دەرخەری تر، بێجگە لە ئاوەڵناوەکە کە لە دواوە هاتووە، لەپێشییەوە هەبێت، وەک ڕاناوی ئیشارەت، یان ژمارە، بەم پێیە لە هەموو ئەو جۆرە ڕستانەدا ئەگەر ڕادە بەکارهێنرا، دەبێت لەپێش ئاوەڵناوەوە بێت.




**یاسای ژمارە ... (١٩)**

بۆ دەرکەوتنی (ڕادە) لە فرەیزی ناویدا، سەیری ئەم نموونانەی خوارەوە بکە:

- دیە کوڕ ئیجا زیرەک. (دە کوڕی یەکجار زیرەک.)
- پەنج کتاو فریە قەدیم. (پێنج کتێبی زۆر کۆن.)
- سێ منالْ فریە بیچگ. (سێ منداڵی زۆر بچووک.)
- ئەو دوێتە ئێجا ڕەیینە. (ئەو کچە یەکجار جوانە.)
- دوێتە فریە ڕەیینەگە. (کچە زۆر جوانەکە.)

دەتوانین فرەیزی ناوی بەهۆی ڕاناو، یان ناوی ترەوە فراوان بکەین، بڕوانە ئەم نموونانەی خوارەوە:

١. کیشوەر و داری و ساری هاتن.

٢. دوێتەی داری ئەفامێ.

٣. کوڕەگەم وریاس.

لە (ڕ١)دا، فرەیزی ناوی بریتییە لە زیاتر لە ناوێک کە هەموویان بەشداریان لە کارەکەدا کردووە، ناوەکان بە مۆرفیمی (و) بە یەکەوە بەستراون.




**یاسای ژمارە ... (٢٠)**

ئەشێت لە جێگەی ناوەکان ڕاناوی جوێ دابنێین:

- مە وتە و ئەی چیمن ئەڕا بازاڕ.

لە (ڕ٢) و (ڕ٣)دا، خاوەنێتی دەبینرێت، ئەمەش دەشێت بەهۆی ناوێکەوە، یان بەهۆی ڕاناوێکی لکاو، یان نەلکاوەوە، نیشان بدرێت، ئەگەر دەرخەری ناوەکە (کە ناوکی فرەیزی ناوییە) ناوێک، یان ڕاناوێکی نەلکاو بوو، ئەوا پێویستمان بە مۆرفیمی بەستنەوە دەبێت کە (ێ)یە: بڕوانە ئەم نمونانە:

١. دوێتەگێ مە.[٤١] (کچەکەی من.)

٢. کوڕەگێ داری. (کوڕەکەی دارا.)

٣. ماڵە گێ مە / تن / ئەی / ئوان.

٤. ماڵە گێ ئوان / ئەو.

وەك لە فرەیزی یەکەم و دووەمدا دەردەکەوێت، ناوێك بووەتە دەرخەری ناوێکی تر (بەمەبەستی خاوەنێتی) مۆرفیمی بەستنەوەی نێوان دوو ناوەکە (ێ)یە.

لە فرەیزی سێیەم و چوارەمدا، دەرخەری ناوەکە ڕاناوی جوێیە و مۆرفیمی بەستنەوەش (ێ)یە دەکەوێتە نێوان دەرخەر و دیارخراوەوە.




**یاسای ژمارە ... (٢١)**

لە جێگەی ڕاناوە جوێیەکان دەتوانرێت ڕاناوی لکاو دابنرێت، ئەو ڕاناوە لکاوانەش کە بۆ خاوەنێتی و دەرخەری لە (ز، ف)دا کاردەکەن ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| م | ماڵگەم |
| مان | ماڵگەمان |
| ت، د | ماڵگەت، ماڵگەد |
| تان، دان | ماڵگەتان، ماڵگەدان |
| ی | ماڵگەی |
| یان | ماڵگەیان |

### ١. یاساکانی هەیی (پێوەندی سینتاکسی):

لە (ز، ف)دا هەندێ جار فرەیزی ناوی لە ناوێك زیاتر پێك دێت ئەگەر پێوەندی نێوان ناوەکان لەسەر بنچینەی (هەیی) بێت ئەوا ناوەکان بەهۆی مۆرفیمی بەستنی (ی)یەکی کورت کە هەندێك جار دەریش ناکەوێت[٢٣]، لێك دەدرێن و ناوی یەکەم سەر بە ناوی دووەم دەبێت، ناوی دووەمیش سەربە سێیەم و...تاد. بۆ نموونە:

١. سەر قەزانەگە گوم وی. (سەری مەنجەڵەکە بزربوو).

٢. مە سەر قەزانەگەی ئیوە گوم کردن.

(من سەری مەنجەڵەکەی ئێوەم بزر کرد).

٢. ئازاد قاپیەگەی وە کلیك حجرەگەی من واز کرد.
(ئازاد دەرگاکەی بە کلیلی ژوورەکەی من کردەوە).

- لە (ڕ١)دا، بکەرەکە لە شێوەی فرەیزدایە و لە دوو ناو پێك هاتووە (سەر قەزان) کە بەهۆی (ی)یەکی کورتەوە لە یەك دراون و ناوی یەکەم سەر بە ناوی دووەمە.
- لە (ڕ٢)دا، بەرکار لە شێوەی فرەیزدایە و لە سێ وشە پێك هاتووە (سەر قەزانەگە ئیوە) ناوەکانیش بەهۆی مۆرفیمی بەستنی (ی)ەوە لێك دراون و ناوی یەکەم سەر بە دووەمە و دووەمیش سەر بە سێیەمە.
- لە (ڕ٣)دا، فرەیزی بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە سێ ناو و ڕاناوێکی کەسی پێکهاتووە، ناوەکان بەهۆی ئامرازی بەستنی (ی)یەوە لێك دراون، لە ڕووی واتاشەوە ناوی یەکەم سەر بە دووەمە و دووەم سەر بە سێیەمە.

لە ڕستەی کار تەواودا، ئەگەر زیاتر لە ناوێك پێوەندی هەیی لەنێوانیاندا هەبێت ئەوا ناوە دووبارەکراوەکان بە ڕاناوی (خوە + ڕاناوی لکاو) جێگیر دەکرێت وەك لەم نموونەیەدا:

نەسرین کتاوەگان خوەی فریەتێد. نەسرین کتێبەکانی خۆی ئەفرۆشێت.

ئەم ڕستەیە لە بنجدا بەم جۆرەیە:



نەسرین لە فرەیزی دووەمدا دووبارە کراوەتەوە بە یاسایەکی هەمان لابردنی ناوە دووبارە کراوەکە لادەبرێت و (خوە + ڕاناوی لکاو – بەپێی کەس و ژمارە) جێگەی دەگرێت و ڕستەکە دەبێت بە:

نەسرین کتاوەگان خوەی فرەتێت. نەسرین کتێبەکانی خۆی دەفرۆشێت.

ڕستەی (نەسرین کتاوەگان خوەی دا وە برای نەسرین) لە بنجدا بەم جۆرەیە:




(نەسرین) لە فرەیزی بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆدا دووبارە کراوەتەوە، بە هەمان جۆر (خوە + ڕاناوی لکاو) جێیان دەگرێت، ڕستەکە دەگوێزرێتەوە سیما.

نەسرین کتاوەگان (نەسرین) دا وە برای (نەسرین).

نەسرین کتاوەگان خوەی دا وە برای خوەی.

لەبەرئەوەی دوو (ی) کەوتنە پاڵ یەك، یەکێکیان دەفرێت.

**فرەیزی کاری لە زاری فەیلییدا:**

فرەیزی کاری لە (ز، ف)دا، لە ڕەگی کار و ڕاناوێکی لکاو پێك دێت. ڕەگی کارەکەش، یان ڕەگی ڕابردووە یان ڕەگی داهاتووە، کە سەرچاوەکەیان چاوگە و هەموو کاتە ڕێزمانییەکان بەم دوو ڕەگە دادەڕێژرێن.




ڕەگی کار ڕاناوێکی لکاوی سەر بە هەمان کەس و ژمارەی بکەر وەردەگرێت، چونکە بکەر و کار لە کەس و ژمارەدا ڕێك دەکەون.

جۆر و کاتی کارەکە دەور دەگێڕن لە هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو (واتە مەبەست لە جۆر لە ڕووی هێزەوەیە، تێپەڕ و تێنەپەڕ)، مەبەست لە کاتیش ڕابردوو و داهاتووە. دەرکەوتنی ڕاناوە لکاوەکانیش لەگەڵ ڕەگی کاردا بەم جۆرەیە:

| | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|---|
| ڕابردوو | $A_1$ | $A_1$ |
| داهاتوو | $A_2$ | $A_2$ |

کاڵێم ←——— ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو (کێڵام)

کاڵم ←——— ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو (دەکێڵم)

بێجگە لە ڕەگ و ڕاناوی لکاو و مۆرفیمی تر هەن، کە بەشداری لە دارشتنی جۆرەکانی کاری ڕابردوو و ڕانەبردوودا دەکەن، بۆ نموونە:

نوسانبیم (نووسی بووم)

بنوسیاتام (بم نووسیایە)

نوسم (دەنووسم) ئێستا

نوسم (دەنووسم) داهاتوو

ڕەگی ڕابردووی کار بەهۆی یاساوە لە چاوگەوە وەردەگیرێت. چاوگ لە (ز، ف)دا بە (ن) کۆتایی دێت. بۆ وەرگرتنی ڕەگی ڕابردوو دەبێت (ن) ی چاوگ هەڵبگرین.

ڕەگی ڕابردوو←——— چاوگ – (ن)

**یاسای ژمارە ... (١)**

بۆ نموونە:

کاڵین (کێڵا) کاڵی

خەفتن (نووستن) خەفت

چون (چوون) چو

بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو دەبێت بێجگە لە (ن) دەنگەکانی پێشیشی لابرێن، ئەو دەنگانەش (أ، د، ت، ی، و (گ)).

بڕوانه یاسای ژماره (٢)

ڕەگی داهاتوو ←——— چاوگ − (أ، د، ت، ی، و (گ))

یاسای ژماره ... (٢)

| | |
|---|---|
| کاڵین | کاڵ |
| خەفتن | خەف |
| چون | چ |

لـە هەنـدێك چـاوگدا ڕەگـی داهـاتوو بـەپێی یاسـای ژمـاره (٢) دەسـت ناکەوێت، ئەمەش بەهۆی گۆڕانێکی دەنگییەوە بۆ نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| وەتن (وتن) | :(یەش، یەژ) | − | هەموو دەنگەکان گۆڕاون. |
| خواردن (خواردن) : | خۆ | − | / و / بووه به / ۆ /. |
| خواستن (خواستن): | خواز | − | / س/ بووه به / ز /. |

هـەر بـەهۆی ئـەو ڕەگـەوە و بەیاریـدەی ڕانـاوی کەسـییه لکاوەکـان و هەنـدێك مـۆرفیمی دیکـه بـۆ داڕشـتنی جـۆره جیاوازەکـانی کـاری ڕابـردوو و ڕانەبردوو بەکاردێن، هەموو جۆرەکانی کارێك دادەڕێژرێن. ڕاناوه لکاوەکانیش له (ز، ف)دا دوو دەستەن که هـەر دەسـتەیەکیان لـه داڕشـتنی جۆرێـك، یـان زیاتر له جۆرەکانی کـاردا بەشـداری دەکـات. وەك لـه لاپـەڕه (٤٣) خراوەتـه ڕوو.

دەستەی یەکەم ($A_1$) لەگـەڵ کـاری ڕابـردووی تێپـەڕ و تێنەپـەڕ و ($A_2$) لەگـەڵ کـاری داهـاتوودا چ تێپـەڕ و چ تێنەپـەڕ، بـەکاردەهێنرێت. هەرچـی دەستەی دووەمه (B) لەگەڵ کاری داهاتوو کاتێك، که ڕۆڵی بەرکار دەبینێت، بەکاردەهێنرێت.

یەکەم: کاری ڕابردووی ئیخباری ڕووتی تێپەڕ: م یمن

کاری ڕابردووی ئیخباری ڕووتی تێپەڕ ←—— ڕەگی ڕابردوو + یت/ ید ین

∅ ن

**یاسای ژمارە ... (٣)**

بۆ وێنە لە چاوگی (نوسانن) بەم شێوەیەی خوارەوە کاری ڕابردووی ئیخباری ڕووت بۆ هەموو کەسەکان دادەڕێژرێت:

| | |
|---|---|
| نوسام | (نووسیم) |
| نوسایت/ ید | (نووسیت) |
| نوسا | (نووسی) |
| نوسایمن | (نووسیمان) |
| نوساین | (نووسیتان) |
| نوسان | (نووسییان) |

دووەم: کاری ڕابردووی ئیخباری ڕووتی تێنەپەڕ:

ئەم دەمکاتەی کار لە ڕەگی ڕابردووی چاوگ و ڕاناوی لکاو پێك دێت:

کاری ڕابردووی ئیخباری ڕووتی تێنەپەڕ ←—— ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژمارە ... (٤)**

بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| مە خەفتم | (نووستم) |
| تە/ خەفیت/ ید | (نووستیت) |
| ئەو خەفت | (نووست) |
| ئیمە خەفتیمن | (نووستین) |
| ئیوە خەفتن | (نووستن) |
| ئەوان خەفتن | (نووستن) |

سێیەم: کاری ڕابردووی ئیخباری نزیکی تێپەڕ:
بەهۆی ڕەگی ڕابردوو مۆرفیمی ڕابردووی نزیك و ڕاناوێکی لکاوەوە پێك دێت بڕوانە یاسای ژمارە (٥).
کاری ڕابردووی ئیخباری نزیکی تێپەڕ ←——— ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو + مۆرفیمی ڕابردوو

**یاسای ژمارە ... (٥)**

بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| نوسامه | (نووسیومه) |
| نوسایده | (نووسیوته) |
| نوسایه | (نووسیویەتی) |
| نوساینه | (نووسیومانه) |
| نوساینه | (نووسیوتانه) |
| نوساننه | (نوسیویانه) |

چوارەم: کاری ڕابردووی ئیخباری نزیکی تێنەپەڕ:
ئەم جۆرەش له ڕەگی ڕابردووی چاوگ لەگەڵ مۆرفیمی ڕاناوی لکاو و مۆرفیمی نیشانەی کاری ڕابردووی کاری ئیخباری نزیك دروست دەبێت.
کاری ڕابردووی ئیخباری نزیکی تێنەپەڕ ←——— ڕەگی ڕابردوو + نیشانەی کاری ڕابردووی ئیخباری نزیکی تێنەپەڕ + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژمارە ... (٦)**

| | |
|---|---|
| وەك: مه خەفتمه | (نووستووم) |
| ته خەفتیده | (نووستوویت) |
| ئەو خەفتیه (خەفتگه) | (نووستووه) |
| ئیمه خەفتینه | (نووستووین) |

| | |
|---|---|
| ئیوه خەفتینه | (نووستوون) |
| ئەوان خەفتنه | (نووستوون) |

**پێنجەم: کاری ڕابردووی ئیخباری دووری تێپەڕ:**

ئەم جۆرەیان جگه لـه ڕەگـی ڕابـردوو ڕانـاوی لکـاو، مـۆرفیمی (بـوو)ش بەشداری له دروستکردنی کارەکەدا دەکات. بڕوانه یاسای ژماره (۷).

کاری ڕابردووی ئیخباری دووری تێپەڕ ←—— ڕەگـی ڕابـردوو + مـۆرفیمی (بو) + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژماره ... (۷)**

وەك:

| | |
|---|---|
| نوسانبوم (نوسانیم) | (نووسی بووم) |
| نوسانبوت | (نووسی بووت) |
| نوسانبی (نوسانوی) | (نووسی بووی) |
| نوسانبویمن | (نووسی بوومان) |
| نوسانبوین | (نووسی بووتان) |
| نوسانبون | (نووسی بوویان) |

**شەشەم: کاری ڕابردووی ئیخباری دووری تێنەپەڕ:**

له ڕەگی ڕابردووی چاوگ لەگـەڵ نیشـانەی کـاری ڕابـردووی دوور (بـوو) لەگەڵ ڕاناوی لکاو پێك دێت.[٤٢]

کاری ڕابردووی ئیخباری دووری تێنەپەڕ ←—— ڕەگی ڕابردوو + نیشانەی کاری ڕابردووی دوور (بوو) + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژماره ... (۸)**

بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| خەفتبوم | (نووستبووم) |
| خەفتبويد | (نووستبويت) |
| خەفتبو | (نووستبوو) |
| خەفتبويمن | (نووستبووين) |
| خەفتبوين | (نووستبوون) |
| خەفتبون | (نووستبوون) |

**حەوتەم: کاری ڕابردووی ئیخباری بەردەوامییە تێپەڕ و تێنەپەڕ:**

**هەرچی کاری ڕابردووی ئیخباری بەردەوامییە تێپەڕ و تێنەپەڕ لە (ز، ف)دا لە شێوەی ڕابردووی ئیخباری ڕووتدا دادەڕێژرێت. بڕوانە یاسای ژمارە (٩) بەڵام لە هەندێ ناوچەی وەك بەغدا و کوت و عیمارەدا (د)ی بەردەوامی دەردەکەوێت.**

**کاری ڕابردووی ئیخباری بەردەوامی ←―――― نیشانەی بەردەوامی + ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو**

**یاسای ژمارە ... (٩)**

**<u>تێپەڕ</u>**

| | |
|---|---|
| دکردم | (دەم کرد) |
| دکردید | (دەت کرد) |
| دکرد | (دەی کرد) |
| دکرديمن | (دەمان کرد) |
| دکردين | (دەتان کرد) |
| دکردن | (دەیان کرد) |

<u>تێنەپەڕ</u>

| | |
|---|---|
| دخەفتم | (دەنووستم) |
| دخەفتید | (دەنووستیت) |
| دخەفت | (دەنووست) |
| دخەفتیمن | (دەنووستین) |
| دخەفتین | (دەنووستن) |
| دخەفتن | (دەنووستن) |

**هەشتەم: کاری ڕابردووی ئینشائی ڕووتی تێپەڕ:**

بەهۆی ڕەگی ڕابردوو و نیشانەی جۆری کار و ڕاناوی لکاوەوە دادەڕێژرێت.

بڕوانە یاسای ژمارە (١٠).

کاری ڕابردووی ئینشائی ڕووتی تێپەڕ ←―― نیشانەی جۆری کار + ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژمارە ... (١٠)**

| | |
|---|---|
| بنوسیامەی | (نووسیبام) |
| بنوسیایدەی | (نووسیبات) |
| بنوسیادەی | (نووسیبای) |
| بنوسیایمنەی | (نووسیبامان) |
| بنوسیاینەی | (نووسیباتان) |
| بنوسیانەی | (نووسیبایان) |

| | |
|---|---|
| کاری ڕابردووی ئینشائی نزیکی تێپەڕ | بنوسیاتام (نووسیبیتم) |
| کاری ڕابردووی ئینشائی بەردەوامی تێپەڕ | بنووسیاتام (بم نووسیبا) |
| کاری ڕابردووی ئینشائی دووری تێپەڕ | بنوسیاتام (نووسیبووبام) |

ئەم کاتانەی کار هەموویان لە زاری فەیلیدا بەرانبەرەکەیان یەك شێوەیە ئەمەش وەك یاسای ژمارە (١٠)ە، بەڵام لەگەڵ ڕەگی داهاتوودا.

**نۆیەم: کاری ڕابردووی ئینشائی بەردەوامی تێنەپەڕ:**

ئەم دەمکاتەی کار لە ڕەگی ڕابردوو لەگەڵ نیشانەی جۆری کار و ڕاناوی لکاو دروست دەبێت. بڕوانە یاسای ژمارە (١٠).

کاری ڕابردووی ئینشائی بەردەوامی تێنەپەڕ ←—— نیشانە کاری ئینشائی + ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژمارە ... (١١)**

**بۆ نموونە:**

| | |
|---|---|
| خوزیا مە بخەفتام | (خۆزگە من بنووستبام) |
| خوزیا تن بخەفتاید | (خۆزگە تۆ بنووستبایت) |
| خوزیا ئەو بخەفتیا | (خۆزگە ئەو بنووستبا) |
| خوزیا ئیمە بخەفتایمن | (خۆزگە ئێمە بنووستباین) |
| خوزیا ئیوە بخەفتیاین | (خۆزگە ئێوە بنووستبان) |
| خوزیا ئەوان بخەفتیان | (خۆزگە ئەوان بنووستبان) |

**دەیەم: کاری ڕانەبردووی ئیخباری تێپەڕ و تێنەپەڕ:**

ڕەگی داهاتووی چاوگ لەگەڵ ڕاناوی لکاو کاری ڕانەبردووی ئیخباری تێپەڕ و تێنەپەڕ پێك دەهێنن:

کاری ڕانەبردووی ئیخباری تێپەڕ و تێنەپەڕ ←—— ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژمارە ... (١٢)**

**بۆ نموونە: (تێپەڕ)**

| | |
|---|---|
| نوسم | (دەنووسم) |

| | |
|---|---|
| نوسيت/يد | (دەنووسيت) |
| نوسێد | (دەنووسێت) |
| نوسيمن | (دەنووسين) |
| نوسين | (دەنووسن) |
| نوسن | (دەنووسن) |

(تێنەپەڕ)

| | |
|---|---|
| خەفم | (دەنوم) |
| خەفيد | (دەنويت) |
| خەفێد | (دەنوێت) |
| خەفيمن | (دەنوين) |
| خەفين | (دەنون) |
| خەفن | (دەنون) |

**يازدەيەم: كارى ڕانەبردوى ئيلزامى:**

**كارى ڕانەبردووى ئيلزامى تێپەڕ و تێنەپەڕ لە مۆرفيمى (ب)ى ئيلزامى و ڕەگى داهاتوو لەگەڵ ڕاناوى لكاو پێك دێت:**

**كارى ڕانەبردووى ئيلزامى تێپەڕ و تێنەپەڕ ←—— مۆرفيمى (ب) + ڕەگى داهاتوو + ڕاناوى لكاو**

**ياساى ژمارە ... (١٣)**

**وەك: (بۆ تێنەپەڕ)**

| | |
|---|---|
| بخەفم | (بنوم) |
| بخەفيد | (بنويت) |
| بخەفێد | (بنوێت) |
| بخەفيمن | (بنوين) |
| بخەفين | (بنون) |
| بخەفن | (بنون) |

(بۆ تێپەڕ)

| | |
|---|---|
| بنوسم | (بنووسم) |
| بنوسید | (بنووسیت) |
| بنوسێد | (بنووسێت) |
| بنوسیمن | (بنووسین) |
| بنوسین | (بنووسن) |
| بنوسن | (بنووسن) |

**کاری فەرمان:**

کـاری فرمـان کـاتی ئێسـتا و داهـاتوو دەگرێتـەوە و پێکهـاتنی بـەم شێوەیەی خوارەوەیە:

مۆرفیمی (ب)ی فەرمان + ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو (Ø لەگەڵ تاکدا)

**یاسای ژمارە ... (١٤)**

ب + چو + Ø = بچو

ب + خو + Ø = بخوە

ب + خو + ن = بخوەن

هەر کاتێك کـاری فـەرمان لـە حاڵـەتی ناکردنـدا بـوو، ئـەوا مـۆرفیمی نـاکردن جێگەی مۆرفیمی (ب) دەگرێت.[٤٣]

کاری فرمانی نەفی مۆرفیمی ناکردن + ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو

**یاسای ژمارە ... (١٥)**

مۆرفیمی ناکردنی (مە) + ڕەگی داهاتوو (کە) + (ڕاناوی لکاو Ø) = مەکە[٤٤]

مە + کە + ن = مەکەن

یان مۆرفیمی ناکردنی (نە) + ڕەگی داهاتوو (کە) + (ڕاناوی لکاو) = نەکە

نە + کە + ین = نەکەین

کاری بکەر نادیاریش وەك گرێیەکی کاری دەردەکەوێت. مەبەست لە چەمکی بکەر نادیار بە شێوەیەکی گشتی ئەوەیە کە لە ڕستەدا بکەرەکە واتە ئەو کەسەی بە کارەکە هەڵدەستێت، یان ئەو شتەی ئیشی کارەکە بەجێ دەهێنێت لەبەر هەر هۆیەك لە سیمادا دەرناکەوێت بۆ گواستنەوەی ڕستەی بکەر دیار بۆ ڕستەی بکەر نادیار لە هەموو زمانێك و هەموو زارێکدا دەبێت بکەر لابرێت و بەرکار جێگەی بگرێت. (ز، ف)یش هەر بەو شێوەیە لەپاڵ ئەوەدا کە تایبەتی خۆی هەیە لە گۆڕینی قالبی کارەکەیدا بەپێی یاسا مۆرفۆلۆجیەکانی و لەو ئامراز و وشانەی دەردەکەون.

**هەنگاوەکانی گۆڕینی بکەردیار بۆ بکەر نادیار لە (ز، ف)دا ئەمانەن:**

١. بکەری ڕستەکە و ڕاناوی ڕێکەوتن لادەبرێن.
٢. بەرکار جێگەی بکەر دەگرێت، بەڵام چەمکی بەرکاری هەر دەمێنێت.
٣. ڕەگی داهاتووی کاری ڕستەکە وەردەگیرێت.
٤. ئامرازی بکەر نادیاری (ی) دەخرێتە سەر ڕەگی کارەکە.
٥. نیشانەی کات دەچێتە سەر کە (ا) بۆ کاتی ڕابردوو، (ێ) بۆ کاتی داهاتوو.
٦. ڕاناوێکی لکاو بەپێی کەس و ژمارەی بەرکار، کە جێگەی بکەری گرتووە دەچێتە سەر کارەکە. ئەم هەنگاوانە بە یاسا لە لاپەڕە (٤٨)دا خراونەتە ڕوو.

ئیمە تن دوینیمن (ئێمە تۆمان بینی.)

ئیمە : بکەرە

تن : بەرکاری ڕاستەوخۆیە

یمن : ڕاناوی ڕێکەوتنە

دوینی: ڕەگی داهاتووی (دوینین).

بەپێی ئەوەی لە خاڵی یەکەمدا هاتووە، یەکەم هەنگاو بکەر (ئیمە) و (یمن) ڕاناوی ڕێکەوتن لادەبەین (تن)ی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەچێتە بکەر و دەبێت بە:

تن دوینی

ئینجا ڕەگی داهاتووی کارەکە وەردەگیرێت دەبێت بە:

تن دون

پاشان ئامرازی بکەر نادیاری (ر) دەچێتە سەر ڕەگی کارەکە و دەبێتە:

تن دون + ڕ

بەپێی هەنگاوی پێنجەم نیشانەی کاتی دەچێتە سەر، لەبەرئەوەی کاتی کارەکە لە ڕابردوودایە (ا)ی دەچێتە سەر:

تن دوینرا

بەپێی هەنگاوی شەشەم کارەکە ڕاناوێکی لەباری بەپێی کەس و ژمارەی بەرکار وەردەگیرێت و لە ئەنجامدا دەبێت بە:

تن دوینراید




**یاسای ژمارە .... (١٦)**




**یاسای ژمارە .... (١٧)**

بەم پێیە بەدیار دەکەوێت کە لە (ز، ف)دا (ر) ئامرازی بکەر نادیار و (ا) کاتی ڕابردوو دەنوێنێت و (ێ) کاتی داهاتوو دەنوێنێت، وەك لەم نموونەیەدا دەردەکەوێت.

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کوشرێین | کوش | — | ر | — | ێ | — | ن |
| | ڕەگ | | ئامرازی بکەر نادیار | | کاتی داهاتوو | | ڕاناوی لکاو |
| (د) کوشریان | کوش | — | ر | — | ا | — | ن |
| | ڕەگ | | ئامرازی بکەر نادیار | | کاتی ڕابردوو | | ڕاناوی لکاو |

ئەو کارانەی کە ڕەگی داهاتوویان بە (ە) کۆتایی دێت، کە دەکرێنە بکەر نادیار (ە) دەتوێتەوە.

| چاوگ | ڕەگی داهاتوو | کاری بکەر نادیار |
|---|---|---|
| کردن | (کە) | کریا |
| بردن | (بە) | بریا |
| یان (وردن) | (وە) | وریا |

**یاسای ژمارە .... (١٨)**

هەروەها ئەگەر ڕەگەکە بە (ۆ) کۆتایی هاتبێت ئەو (ۆ)یە دەگۆڕێت بە (و) وەك:

| چاوگ | ڕەگی داهاتوو | کاری بکەر نادیار |
| --- | --- | --- |
| خواردن | خۆ | خوریا |

**یاسای ژمارە ... (١٩)**

لە ڕەگی داهاتووی چاوگی (گرتن)دا ئەو (i)یەی نێوان (گ) و (ر) لە گۆڕینی بۆ کارا بزر دا دەبێتە (ی)، بەپێی هەنگاوەکانی پێشتر:

| چاوگ | ڕەگی داهاتوو | کاری بکەر نادیار |
| --- | --- | --- |
| گرتن | گر | گیریا |

**یاسای ژمارە ... (٢٠)**

هەر ڕەگێکی داهاتووش کۆتایی بە (ڕ) هاتبێت ئەوا لە گۆڕینی بۆ بکەر نادیاردا لەگەڵ (ر)ی نادیاریدا دەبن بە یەك.

| چاوگ | ڕەگی داهاتوو | کاری بکەر نادیار |
| --- | --- | --- |
| دڕین | دڕ | دڕیا |

**یاسای ژمارە ... (٢١)**

لە گۆڕینی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار کاتێك کە بەرکارەکە بە ڕاناوێکی لکاو دەربڕرابێت ئەوا ڕاناوە لکاوەکان بەم شێوەیەی خوارەوە جێگۆڕکێ و ڕێکەوتن لە نێوانیاندا ڕوودەدات:

| دونێدەمان | دون | ێدە | مان |
| --- | --- | --- | --- |
| | ڕەگی داهاتوو | ڕاناوی لکاو/ بکەر | ڕاناوی لکاو/ بەرکار |

| کلتان کەم | کل کە | تان | م |
| --- | --- | --- | --- |
| | ڕەگی داهاتوو | ڕاناوی لکاو/ بەرکار | ڕاناوی لکاو/ بکەر |

له (ڕ١)دا (مان) و له (ڕ٢)دا (تان) بەرکارن.

به گواستنەوەی ڕستەی وا بۆ بکەر نادیار، ئەو ڕاناوه لکاوەی تێیدا ڕۆڵی بەرکاری دەبینێت و جێی بکەر دەگرێت، دەگۆڕێت به ڕاناوی بەرانبەری سەر به کۆمەڵەی تر (م، یت، Ø، یمن، ین، ن) و جێی خۆی دەگۆڕێت دەچێته سەر ڕەگی کارەکه.









**یاسای ژمارە ... (٢٢)**

دەشێت ئەو کارەی کە گرێی کاری پێك دەهێنێت کارێکی تێنەپەڕی بە تێپەڕ کراو بێت. یاسای گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ بەهۆی مۆرفیمی (اند)ەوە دەبێت، کە دەچێتە سەر ڕەگی ڕانەبردوو، ئەگەر (ن)ی نیشانەی چاوگ بلکێنین بە کۆتایی داڕشتنەکەوە ئەوە چاوگێکی کار تێپەڕمان بۆ پێکدێت، بڕوانە یاسای ژمارە (٢٣).

ڕەگی ڕانەبردووی چاوگی تێنەپەڕ + نیشانەی تێپەڕاندن + نیشانەی چاوگ ⟵ چاوگی کار تێپەڕ

(اند) (ن)

**یاسای ژمارە ... (٢٣)**

وەك:

وارین/ بارین

وار + اند + ن ⟵ واراندن – وارانن

خەفتن/ نوستن

خەو + اند + ن ⟵ خەفاندن – خەفانن

لەقیان/ لەقین

لەق + اند + ن ←—— لەقاندن – لەقانن

نیشتن/ دانیشتن

نیش + اند + ن ←—— نیشاندن – نیشانن

ئەگەر بمانەوێت کاری ڕابردوو، یان ڕانەبردوو لەم جۆرە چاوگانەوە داببڕێژین ئەوە دەبێت بەپێی یاسای ژمارە (١) و (٢)ی (فرەیزی کاری) ئەم کارە، ڕەگی ڕابردوو و ڕانەبردوویان وەربگرین و بەپێی یاساکانی دواتری هەمان بەش، جۆرەکانی کاری ڕابردوو، یان ڕانەبردوو داببڕێژین.

بۆ نموونە:

کاری چاوگی (خەفتن)، یان (خەفانن) بەم شێوەیەی خوارەوە بەکاردەهێنین:

- منالەگە خەفت.
- مە منالەگە خەفانم.
- منالەگە خەفێد.
- من منالەگە خەفێنم.

هەموو چاوگێکی تێنەپەڕ، مەرج نییە بە یاسای ژمارە (٢٣) بکرێت بە تێپەڕ، چونکە هەندێك لە چاوگە تێنەپەڕەکان هەر لە بنچینەدا لە زارەکەدا بەرانبەریان چاوگی تێپەڕ هەیە، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| مان | – | هیشتن |
| چون (ڕۆیشتن) | – | هاتن |
| بردن | – | هاوردن (هێنان) |
| کەفتن (کەوتن) | – | خسن (خستن) |

## ناکردن له گرێی کاریدا:

ناکردن کردەیەکی زمانییە، ئەرکی جێبەجێ نەکردن و بەرپەرچدانەوەی بەشێکی، یان هەموو ڕستەکەیە.

ئەم کردەیە لە (ز، ف)دا، بە دانانی نیشانەکانی ناکردن پێش کار، یان ناو ئەنجام دەدرێت:

- نامدار نەهات.
- نە گوڵەنام هات و نە منیش چوم.

نیشانەکانی ناکردن لە (ز، ف)دا سێ جۆر مۆرفیمە:

یەکەم:

مۆرفیمی (نە): ئەم مۆرفیمە، هەموو جۆرە کارێك بێجگە لە (بوون) و (فەرمان) و ڕانەبردووی ئیخباری)، لە (ئەرێ) وە دەگۆڕێت بۆ (نەرێ)، وەك:

| | |
|---|---|
| • من مەکتوبەگە نوسانم. | من مەکتوبەگە نەنووسانم. |
| (من نامەکەم نووسی.) | (من نامەکەم نەنووسی.) |
| • من مەکتوبەگە نوسانمە. | من مەکتوبەگە نەنووسانمە. |
| (من نامەکەم نووسیووە.) | (من نامەکەم نەنووسیووە.) |
| • من مەکتوبەگە نوسانبیم. | من مەکتوبەگە نەنووسانبیم. |
| (من نامەکەم نووسیبوو.) | (من نامەکەم نەنووسیبوو.) |
| • خۆزیا مەکتوبەگە بنوسیاتام. | خۆزیا مەکتوبەگە نەنووسیاتام. |
| (خۆزگە نامەکەم نووسیبا.) | (خۆزگە نامەکەم نەنووسیبا.) |

ئەگەر کاری ڕستە ڕابردووی تێنەپەڕ، یان کاری ڕابردووی بکەر نادیار بێت، بۆ نەرێ کردنیان هەر مۆرفیمی (نە) دەخەینە پێش کارەکەوە، وەك:

| | |
|---|---|
| من چوم | من نەچیم |
| (من ڕۆیشتم) | (من نەڕۆیشتم) |

| | |
|---|---|
| من نوسریام | من نەنووسریام |
| (من نوسرام) | (من نەنووسرام) |

مۆرفیمی (نە) لەگەڵ کاری ڕانەبردووی ئیلزامیشدا بۆ نەرێ کردن بەکاردێت، وەك:

| | |
|---|---|
| بایەسە کار بکەم. | بایەسە کارنەکەم. |
| (دەبێ ئیش بکەم.) | (دەبێ ئیش نەکەم.) |
| بایەسە مەکتوب بنوسم. | بایەسە مەکتوب نەنووسم. |
| (دەبێ نامە بنوسم.) | (دەبێ نامە نەنووسم.) |

دووەم:

مۆرفیمی (مە): ئەم مۆرفیمە بۆ نەرێ کردنی کاری فەرمان بەکاردەهێنرێت، وەك:

| | |
|---|---|
| کار بکە. | کار مەکە. |
| (ئیش بکە.) | (ئیش مەکە.) |
| کار بکەن. | کار مەکەن. |
| (ئیش بکەن.) | (ئیش مەکەن.) |

دەشێت بۆ نەرێ کردنی کاری فەرمان مۆرفیمی ناکردنی (نە)ش بەکاربهێنرێت، وەك:

| | |
|---|---|
| کاربکە. | کارنەکە. |
| کاربکەن. | کارنەکەن. |

نەرێ کردنی کاری فەرمان لە لاپەڕە (٧٧) ڕوونکراوەتەوە.

سێیەم:

مۆرفیمی (نێ): بۆ نەرێ کردنی کاری ڕانەبردووەکە بۆ ئێستا داڕێژرابێت، وەك:

- من ئيسه كاركه‌م.		مه ئيسه كارنێكه‌م.
(من ئێستا ئيش ئه‌كه‌م.)		(من ئێستا ئيش ناكه‌م.)
- مه خوه‌مه‌ی.		مه نیَ خوه‌مه‌ی.
(من ده‌يخۆم.)		(من نايخۆم.)

مۆرفيمی (نی): ئه‌م مۆرفيمه بۆ نه‌ریَ كردنی كـاری بـیَ هێـز بـه‌كاردێت، وه‌ك:

- مه دانام.		مه دانانيم.
(من زيره‌كم.)		(من زيره‌ك نيم.)
- مه زرنگم.		مه زرنگ نيم.
(من ئازام.)		(من ئازا نيم.)

## پەراوێزەکان:

(١)فوئاد حەمە خورشید، ١٩٨٥، لا ٣١.

(٢)مەبەست لە (هەرێمی لورستان) لوڕی بچووکە کە فوئاد حەمە خورشید بە لوڕی فەیلی ناویان دەبات، هەروەها د.کەمال فوئاد لە لاپەڕە (٢٤)ی گۆڤاری زانیاری (١٩٧١)دا بە (فەیلی عێراق) و ناوچەکانی دەوروبەری لە سنووری ئێراندا دیاری کردوون.

(٣)(شرفخانی بدلیسی)، ١٩٧٣، لا ٨١، ٥٩٢.

(٤)(توفیق وهبی) دەورێکی زۆر گەورەی هەبووە لە دامەزراندنی بواری ڕۆشنبیری زمانەوانی و بنیادنانی نووسینەوەی ڕێزمانی کوردی.

(٥)(توفیق وهبی)، و. بکر دلێر، ١٩٥١، لا ٣٢-٣٣.

(٦) د.جەمال نەبەز، ١٩٧٦، لا ١٠.

(٧) د.کەمال فوئاد، ١٩٧١، لا ١٦.

(٨) زبێر بیلال، ١٩٧٧، لا ٦٥.

(٩)فوئاد حەمە خورشید، ١٩٨٥، لا ٦٤.

(١٠) زبێر بیلال، ١٩٩٧، لا ٢٥.

(١١) جعفر خیتال، ١٩٩٠، لا ١١٩.

(١٢) زبێر بیلال، ١٩٩٧، لا ٢٨.

(١٣) هنری فیلد. و. (عبدالله فریار).

(١٤) جعفر خیتال، ١٩٩٠، لا ١٢٥.

(١٥) قەرەوڵوس، کەهریز، ئەرکەواز، مەڵەك شاه ...تاد.

(١٦) أفضل مقیمي، ١٩٩٤، لا ٨٥.

(١٧)دەنگی /ع/یش لەم زارەدا، لە زۆر شوێندا بە (ئـ) دەردکێندرێت، دیارە ئەو وشانەی ئەم دەنگەیان تێدایە بەزۆری لە نەژاددا عەرەبین، ئەمەش دیاردەیەکی دیاری ناو هەموو دیالێکتە کوردییەکانە.

(١٨)لە فەرهەنگی گەرمەسێردا کە تایبەتە بەم زاراوە و هەندێ لە فەرهەنگەکانی تری وەك (فەرهەنگی لەك و لوڕ)ی حمید ایزدپناه لەم وشەیە زیاترم بەرچاو نەکەوت کە

ئەم دەنگەی تێدا بێت، بەڵام لە هەندێ وشەی تری ناڕەسەندا دەبینرێت.

* دەڵێن دەنگی /غ/ کورد نەژاد نیە، بەڵکو /خ/ ڕەسەنترە.

(١٩) لە زۆرترینی شێوەکانی ئەم زارەدا دەنگی /ع/ بە /ئـ/ دەدرکێنرێت.

(٢٠) هەموو لامێکی لاواز لەو وشانەدا کە لە بێگانە بەتایبەتی لە عەرەبییەوە وەرگیراون دەبێتە لامی قەڵەو. وەك: هەسەڵ، جەوەڵ، کەماڵ، موڵڵا ... تاد.

(٢١) /ی/ لە سەرەتای وشەدا نایەت لە دەنگە سروشتییەکاندا نەبێت.

(٢٢) ئەم دەنگە لە دەربڕیندا وەك دەنگی /ue/ فەرەنسییە.

(٢٣) ئەم دیاردەیە زیاتر پێوەندی بە لایەنی فۆنۆلۆجیەوە هەیە، چونکە (ی) خستنە سەر لەم زارەدا ئەگەر لە نێوان دوو ناودا هات کە یەکەمیان کۆتایی بە (ا) یان (ە) هاتبێت ئەوا دەردەکەوێت، بەڵام لە وشەکانی تردا دەرناکەوێت، وەك: سوپای کورد. مەشکەی دۆ.

(٢٤) (بوون) دانەیەکی فرەئەرکە، لێرەدا ئێمە تەنیا باسی ئەم ئەرکەیان دەکەین.

(٢٥) بە ڕای هەندێ لە خوێندەوارانی وەك (مەلا شوکر مستەفا)، ئەم پاشگرە تورکییە.

(٢٦) بەلای هەندێك لە زمانەوانانەوە، ئەمانە ڕاناو نین و سەر بە بەشی تری ئاخاوتنن، لەم کارەدا بە ڕاناویان لە قەڵەم دەدەین، چونکە لە ڕووی ئەرکەوە جۆرە لەیەکچوونێك لە نێوانیاندا هەیەو هاوبەشن لە کەرەسەی سیمانتیکی (کەس).

(٢٧) (من) زیاتر کە لە سەرەتای ڕستەدا بێت و ڕۆڵی بکەر بگێڕێت لە شێوەی (مە)دا دەردەکەوێت وەك لەم نموونەیەدا: تە دور مە دور، ڕێ مەنزڵ هەر دور دورییەگەی تنە مە داگەس لە تیر هەروەها (تن) زۆرترینی لە سەرەتای ڕستەدا و کە دەوری بکەری ڕستەکە دەبینێت لە شێوەی (تە)دا دەردەکەوێت.

(٢٨) ئەحمەد شەریفی، ١٣٧٣، لا ٧٤.

(٢٩) هەمان سەرچاوە، لا ١٤٢.

(٣٠) ئیرەج محەرر، ١٣٧٣، لا ٧٥.

(٣١) لە لاپەڕە (  )دا بە یاساوە لەگەڵ کاری (بوون) باس کراوە.

(٣٢) أ. (ئە)ی بەردەوامی لە ڕانەبردووی ڕووتدا دەرناکەوێت، بەڵکو لە ڕابردووی ئیخباری بەردەوامیدا دەردەکەوێت.

ب. له هەندێك لەو ناوچانەی فەیلییەکانی تێدا نیشتەجێن وەك (مەندەلی) ڕاناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك له جێگەی مۆرفیمی (د) مۆرفیمی (ێگ) بەکاردەهێنرێت.

(٣٣) بۆ کەسی سێیەمی تاك /ف/ و /د/ له نێوانیاندا ڤاوڵی /ێ/ دەردەکەوێت بۆ ئاسان کردنی گۆکردن.

(٣٤) بۆ ئاسانی گۆکردن.

(٣٥) هەندێك چاوگ له کاتی وەرگرتنی ڕەگی داهاتوویاندا به شێوەیەکی ناوێزه دەنگی /ر/ی پێش نیشانەی چاوگیان تیا دەچێت. ئەم دەنگه لە کاتی داڕشتنی کاری ڕانەبردوو و فەرماندا دەرناکەوێت (تەنیا بردن نەبێت که له فەرماندا دەردەکەوێت)، بەڵام لەکاتێکدا که بەرکار دەکەین به ڕاناوی لکاو لەگەڵ کاری فەرماندا دەنگی /ر/ دەردەکەوێتەوە، وەك له چاوگی (بردن، کردن، خواردن ... تاد)دا دەردەکەوێت، بۆ نموونە:

خواردن: خوەم – بخوە – خوەمەی – بخوەرەی

(دەخۆم) (بخۆ) (دەیخۆم) (بیخۆ)

بەڵام له (بردن)دا بەم شێوەیه دەبێت:

بردن: بەم – بوەر – بەمەی – بوەرەی

(دەبەم) (ببە) (دەیبەم) (بیبە)

(٣٦) مۆرفیمی (Ø) لێرەدا ڕاناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاك که له داڕشتنی کاری فەرماندا بەکاردەهێنرێت. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی داڕشتنی کاری فەرمان بڕوانه ئەم باسه له لاپەڕە ( )دا.

(٣٧) وریا عومەر ئەمین، ١٩٨٢، لا ٣٨.

(٣٨) هەندێك جار بەهۆی کاریگەری دیالێکتی سۆرانییەوە، فەیلییەکان زۆر وشه بەبێ ئەوەی ئاگایان له خۆیان بێت، دوو جار کۆدەکەنەوە، بۆ نموونە: (پیاوەیلەگان) پیاو + (ێل) مۆرفیمی کۆ + (ان) مۆرفیمی کۆ.

(٣٩) (ی)ی ئیزافه لەم زارەدا زۆر کورتە. به ڕادەیەك له هەندێ شوێندا تەنیا وەك شوێنەواری (ی)ێك دەردەکەوێت و تەنانەت له هەندێ شوێنی تردا هەروەك نەبێت وایه. (ماڵ خاڵۆم)، (کوڕ مەمۆم).

(٤٠) راناوی (ئەیە) لە ئاخاوتندا زۆرجار لە شێوەی (یە)دا دەردەکەوێت بۆ نێر و مێ، ئەمەش هیچ هۆیەکی ڕێزمانی نییە، بەڵکو تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ کورت کردنەوە لە ڕستەی ئاڵۆزدا بە تایبەتی لە قسەکردنی ناڕەسمیدا.

(٤١) مۆرفیمی ناسیاری لە (ز، ف)دا (ەگە)یە، کاتێك مۆرفیمی خاوەنێتی (ی) دەچێتە سەر، گۆڕانی فۆنەتیکی بەسەردا دێت و شێوەی (گێ) وەردەگرێت بەیەکەوە.

(٤٢) ئەم دەمکاتەی کار بەپێی ناوچە گۆکردنەکەی گۆڕانی بەسەردا دێت واتە لە دوو فۆڕمی تردا دیار دەکەوێت، کە ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| خەفتبیم | خەفتووم |
| خەفتبید | خەفتوویت |
| خەفتبی | خەفتووی |
| خەفتبیمن | خەفتوویمن |
| خەفتبیین | خەفتووین |
| خەفتبین | خەفتوون |

(٤٣) هەندێ زمانەوان نەهی و نەفی لێك جیادەکەنەوە.... لەم باسەدا هەردوو هەمان شتن لەبەر نەبوونی پێوانەیەکی ڕوون بۆ جیاکردنەوەیان.

(٤٤) مۆرفیمی ناکردن لە کاری فەرماندا (نە، مە)یە، بەڵام لە شێوەکانی تری کاردا لە شێوەی (نێ)دا دەردەکەوێت، وەك لە لاپەڕە (٨٣) ڕوونکراوەتەوە.

## پاشکۆ

# لیستەی هەندێ چاوگ لە زاری فەیلیدا

کۆمەڵەی بە (ا) کۆتایی هاتوو:

| | |
|---|---|
| پەنەمیان | ئاوسان |
| پیشیان | پیشان |
| دڕیان | دڕین |
| ترسیان | ترسان |
| سڕیان | سڕین |
| تووڕیان | تۆران |
| خنکیان | خنکان |
| رشیان | ڕژان |
| رمیان | ڕوخان |
| سوزیان | سووتان |
| لەوەڕیان | لەوەڕین |
| مایین | مەیین |
| شێویان | شێوان |
| کوڵیان | کولاّن |
| گەڕیان | گەڕان |
| لەرزیان | لەرزان |
| مەنیان (مەنن) | مان |
| وسیان | وەستان |
| گیریان | گرتن |

| | |
|---|---|
| پێچیان | پێچان |
| پێویان | پێوان |
| رزیان | ڕزین |
| لەرزیان | لەرزین |
| پچڕیان | پچڕین |
| پۆشیان | پۆشین |
| بەخشیان | بەخشین |
| بڕیان | بڕین |
| وەڕیان | وەڕین |
| نان | نان |
| تەزیان | تەزین |
| تەپیان | تەپین |
| پەڕیان | پەڕین |
| لەقیان | لەقین |
| گەنیان | گەنین |
| چڕچگیان | ڕاچڵەکین |
| نوسان | نووسین |
| سمیان | سمین |
| دۆشیان | دۆشین |
| تاشان | تاشین |
| چقیان | چەقین |
| بەسان (بەسیان) | بەستن |
| قروژیان | کرۆشتن |
| رشان (رشیان) | ڕشتن |

| | |
|---|---|
| وشكيان | پشكنين |
| ئەڵاژیان | پاڵكەوتن |
| ئەڵچییان | هەڵپچڕان |
| ماسیان | خەستبونەوە |
| لكیان | لكان |
| لەنگیان | لەنگان |
| شێویان | ئاڵۆزان |
| تاسیان | خنكان |
| گلیان | گلان |

كۆمەڵەی بە (د) كۆتایی هاتوو:

| | |
|---|---|
| هاوردن | هێنان |
| سەندن | كڕین |
| شوردن | شوشتن |
| گردن | گرتن |
| مردن | مردن |
| خواردن | خواردن |
| كردن | كردن |
| ئەڵاوردن | ڕشانەوە |
| ژان كردن | ئێشان |

كۆمەڵەی بە (ت) كۆتایی هاتوو:

| | |
|---|---|
| گیرستن | گریان |
| خەنستن | پێكەنین |
| زانستن | زانین |
| توانستن | توانین |

| | |
|---|---|
| خەفتن | نووستن |
| کەفتن | کەوتن |
| نیشتن | دانیشتن |
| ژنەفتن | بیستن |
| چەشتن | چێشتن |
| پەرستن | پەرستن |
| کوشتن | کوشتن |
| خوەنستن | خوێندن |
| وەتن | گوتن |
| خواستن | ویستن |
| فریەتن | فرۆشتن |

**کۆمەڵەی بە (ی) کۆتایی هاتوو:**

| | |
|---|---|
| دوینین | بینین |
| چنین | چنین |
| پرسین | پرسین |
| هەڕین | هاڕین |
| ماڵین | ماڵین |
| مژین | مژین |
| ژەنین | ژەنین |
| جایین | جون |
| سایین | سون |
| رەسین | گەیشتن |
| گەزین | گەستن |
| گەردین | گەڕان |
| ئەڵپاچین | هەڵپاچین |

| | |
|---|---|
| ئەڵپەڕین | هەڵپەڕین |
| ئەڵکلاشین | هەڵکڕاندن |
| ماڵین | ماڵین |
| وارین | بارین |
| وەزین | بەزین |
| چڕین | بانگکردن |
| کاڵین | کێڵان |

**کۆمەڵەی بە (و) (گ) کۆتایی هاتوو:**

| | |
|---|---|
| چوگن | چوون |
| بوگن | بوون |

**کۆمەڵەی بە (ن) کۆتایی هاتوو:**

| | |
|---|---|
| دورانن | دورین |
| ئەڵدڕیانن | هەڵکەندن |
| ئەڵتیزگانن | فڕاندن |
| ئەڵڕواکانن | فڕاندن |
| ئەلواقانن | هەڵفڕانن |
| لولانن | لوڕاندن |
| لڕانن | لول کردن |
| مەزرانن | ڕێکخستن |
| مڕانن | پاڵاوتن |
| مقانن | منگەمنگ کردن |
| ورشانن | برژاندن |
| تاسیانن | خنکاندن |
| رشانن | ڕژاندن |
| ولاتن | شێلاندن |

# سەرچاوەکان:

## سەرچاوەکان بە کوردی


١. ئەورەحمانی حاجی مارف، (١٩٨٧)، ڕێزمانی کوردی (وشەسازی) — وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن/ بەغدا.

٢. ئەورەحمان حاجی مارف، (١٩٩٣)، ئەو کارانەی ڕیژەیان لە دەستوور لادەدەن، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣١).

٣. ئەورەحمان حاجی مارف، (١٩٩٧)، چاوگ و کێشەی کردار لە زمانی کوردیدا — ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠).

٤. ئیرەج محەرر، (١٣٧٣)، ژن لوڕ لە بەڵگە نامەیل تاریخی — ئاوێنە — ژمارە (١٧-١٨)، کرمانشاه.

٥. ئەحمەد شەریفی، (١٣٧٣)، لهجە ازلی کرمانشاهی — ئاوێنە — ژمارە (١٩)، کرمانشاه.

٦. توفیق وەهبی، (و. بەکر دلێر) — (١٩٥١) — ئەشکەوتەکەی گەندۆك، بەغدا.

٧. جەمال نەبەز، (١٩٧٦)، زمانی یەکگرتووی کوردی — یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە شاری بامبێرگ، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا.

٨. حەسەن سەلاح، (١٣٧٢)، زاراوەی کەلڕی دیرامەدی کرماشان — ئاوێنە ژمارە (٦٣)، کرمانشاه.

٩. حشمت الله طبیبی (١٣٧٦)، من توام هەمیشە لەبارەی کرماشان بویشم — ئاوێنە، ژمارە (٢١-٢٢)، کرمانشاه.

١٠. ڕەئوف ئەحمەد ئالانی، (١٩٨١)، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا — وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن — بەغدا.

١١. زبیر بیلال اسماعیل، (١٩٨٥)، مێژوی زمانی کوردی (و. یووسف ڕەئووف عەلی) وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن — بەغدا.

١٢. عەبدولموحسین بەنیی وەیس، (١٩٨٨)، گەردانەی ئەڵوەن — دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی — بەغدا.

١٣. غازی فاتیح وەیس، (١٩٨٤)، فۆنەتیك — ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان.

١٤. فوئاد حەمە خورشید، (١٩٨٦)، لوڕ — دانیشتووانی هەرێمی باشووری کوردستانی ئێران — ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١).

١٥. كەمال فوئاد، (١٩٧١)، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان — گۆڤاری زانیاری ژمارە (٤).

١٦. کەریم زەند، (١٩٨٦)، زەوی شناسی — لوڕستان — نووسەری کورد — ژمارە (١) خولی سێیەم.

١٧. محەمەد ئەمین هەورامانی، (١٩٧٤)، سەرەتایەك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی — وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن — بەغدا.

١٨. محەمەد ئەمین هەورامانی، (١٩٨١)، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا — وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن — بەغدا.

١٩. نیعمەت عەلی سایە ، (١٩٨٧)، ناو و ڕاناو لە زاری کەلهوڕی دا — ڕۆشنبیری نوێ — ژمارە (١١٦).

٢٠. نیعمەت عەلی سایە ، (١٩٨٨)، گەوهەری گەرمەسێر — فەرهەنگی کوردی/عەرەبی/ زاری کەلهوڕی — بەشی یەکەم — بەغدا.

٢١. نیعمەت عەلی سایە ، (١٩٨٨)، گەوهەری گەرمەسێر — فەرهەنگی کوردی/عەرەبی/ زاری کەلهوڕی — بەشی دووەم — بەغدا.

٢٢. نیعمەت عەلی سایە ، (١٩٨٨)، گەوهەری گەرمەسێر — فەرهەنگی کوردی/عەرەبی/ زاری کەلهوڕی — بەشی سێیەم — بەغدا.

٢٣. نیعمەت عەلی سایە ، (١٩٨٨)، کار لە زاری کەلهوڕی دا — ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٠)، بەغدا.

٢٤. وریا عومەر ئەمین، (١٩٨٢)، ئیملای کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق بەرگی (٩) — بەغدا.

٢٥. وریا عومەر ئەمین ، (١٩٨٥)، لە ئەنجامەکانی زانستی زمان، نووسەری کورد — ژمارە (١).

٢٦. وریا عومەر ئەمین ، (١٩٨٦)، بناغەی سادەترین ڕستەی کوردی — ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١).

٢٧. وریا عومەر ئەمین ، (١٩٨٧)، ڕێزمانی ڕاناو — هەندێ شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی — ڕۆشنبیری نوێ — ژمارە (١١٥).

٢٨. وریا عومەر ئەمین ، (١٩٨٩)، بنج و سیما و یاساکانی گوێزانەوە، ڕۆشنبیری نوێ — ژمارە (١٢١).

٢٩. وریا عومەر ئەمین ، (١٩٨٩)، فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق بەرگی (٢٠) — بەغدا.

٣٠. وريا عومەر ئەمین ، (١٩٩٨)، ڕێزمانی هەیی لە زمانی کوردیدا – ڕۆشنبیری نوێ – ژمارە (١٤١) – بەغدا.

## نامەی ماجستێر

١. رەحمان ئیسماعیل حەسەن، (١٩٩١)، برگە و ئاسان بوونی برگە لە کوردیدا – نامەی ماجستێر – کۆلێجی ئاداب – زانکۆی سەلاحەدین.
٢. مەحموود فەتحوڵڵا ئەحمەد، (١٩٨٨)، کار تەواوکردن لە کوردیدا – نامەی ماجستێر – کۆلێجی ئاداب – زانکۆی سەلاحەدین.
٣. مەهاباد کامیل عەبدوڵڵا، (١٩٩٦)، کار لە کرمانجیی خوارو و هەورامیدا – نامەی ماجستێر – کۆلێجی ئاداب – زانکۆی سەلاحەدین.

## سەرچاوەکان بە عەرەبی

١. امين زكي، (١٩٦١)، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من أقدم العصور التاريخية حتى الآن – مطبعة صلاح الدين – بغداد.
٢. زبير بلال اسماعيل، (١٩٧٧)، تاريخ اللغة الكردية – مطبعة الحوادث – بغداد.
٣. زبير بلال اسماعيل، (١٩٩٧)، اللّر ولورستان في المصادر الجغرافية العربية القديمة – مجلة زاگروس.
٤. فؤاد حمه خورشيد، (١٩٧٩)، العشائر الكردية، مطبعة الحوادث – بغداد.
٥. فؤاد حمة خورشيد، (١٩٨٣)، اللغة الكردية، التوزيع الجغرافي للهجاتها – المكتبة الوطنية – بغداد.
٦. مصطفى جواد، (١٩٧٣)، (جاوان) القبيلة الكردية المنسية ومشاهير الجاوانيين، المجمع العلمي العراقي – بغداد.

## سەرچاوەکان بە فارسی

١. أفضل مقيمي، (١٩٩٤/١٣٧٣)، بررسى گويش بوير أحمد و ... انتشارات نويد شيراز – تهران.
٢. جعفر ختيال، (١٩٩٠/١٣٦٩)، مجموعه آراء دربارهء ساكنين سرزمين پشتكوه ايلام – كتابخانه اسماعيلى – چاپخانه فرهنگ.
٣. ايرج أفشار، (١٩٨٧/١٣٦٦)، نگاهى به ايلام، نشر هنر، تهران.

## ناوەرۆک